

**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

- **سێگۆشەی سنوور**
- نووسەر: **سەلام عەبدوڵڵا**
- تایپ و هەڵەچنی: **گوڵباخ بەهرامی**
- نەخشەسازیی بەرگ و ناوەڕۆک: **شکار عەفان نەقشبەندی**
- نرخ: **٤٠٠٠ دینار**
- **چاپی یەکەم ٢٠١٤**
- تیراژ: **١٠٠٠ دانە**
- چاپخانە: **موکریانی (هەولێر)**
- لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٨٥١)ی ساڵی ٢٠١٤ی پێدراوە.

**زنجیرەی کتێب (٩٠٥)**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info.mukiryani.com

**وێنەی بەرگی پێشەوە نووسەر لە ساڵی ١٩٧٧**

پێشکەش،

بە دایکم کە نەخوێندەوار بوو و فێری کوردایەتی کردم

بە باوکم کە پێش قوتابخانە فێری خوێندەواری کردم..

ڕۆژیان شاد

## پێشەکی

کاتێک پێناسەی رۆمان دەکرێ بە جۆرێک لە جۆرەکانی ئەدەبی بەیتئامێز ناو دەبرێ، دیارە هەرچۆن سەرجەم بوارەکانی ئەدەب و هونەر بە پێی بەرەو پێشەوەچوونی رۆژگار، گۆڕانکاری و پەرەسەندن بەخۆیەوە دەبینێ، ئەمەش پەیوەستی خاسییەتی زیندوو و گەشەدارەکەیەتی.

لە دێریندا، دوو جۆر رۆمان هەبوو، یەکەمیان: رۆمانی جەربەزەیی، دووەمیان: شوانکارەیی، لە هەر جۆرەیاندا خەیاڵ بڵاویی و خولقاندنی کەش و دۆخ و باری سەرنجڕاکێشەر، دەبووە مایەی چەشەکردنی خوێنەر یان بیسەر و ناچاری وەدووکەوتنی ئاکامی رووداوەکانی دەکرد و کۆسپ و تەگەرەکان بواری بێلایەنی نەدەهێشتەوە بۆ خوێنەرە.

دیارە لە رۆژانی چاخەکانی ناوەڕاستدا، ئەمیش وەک کۆی بەرهەمە بزوێنەرەکان ، کەوتبووە داوی بەستەڵەک و مەیینەوە، کەواتە لە سای حوکمی ئەو بیرە ئۆرستۆکراتیزمانەدا کە ئایین و دەرەبەگایەتی و پاشایەتی راگری بوون، خەفەی کردبوو، هەر بۆیە لە مێژووی ئەدەبی رۆمان دا ، ئەو چاخانە بێبەشن.

دیارە سەدەی رێنێسانس بووژاندنەوەی لە سەرجەم خانەکانی کۆمەڵگادا کرد، کاتێ کە گۆڕانکارییە بە زەبرەکانی باری ئابووری، سەرجەم بیر و بۆچوون و سیستەمی ئەو ژیانەی پێشووی هەڵتەکاند، ئیدی دەرووی پەڕینەوەی بۆ

سەدەکانی نویٚ والاّ کراو تەنانەت لە سەدەی هەژدەهەمەوە چەندین تەرزی نویٚ لە جیهانی ئەدەبی رۆماندا سەریهەڵدا، وەک رۆمانی کۆمەلاّیەتی ، مێژوویی، رۆمانتیکی، وەک لە لایەن (ڤیکتۆر هۆگۆ) و (جۆرج ساند) کە پتر بایەخی بە نواندنی گیانی ناخی مرۆڤ دەدا، بلاّوکرانەوە.

لە سەدەی نۆزدەهەمەوە بە تایبەت لە نیوەی دووەمییەوە، پەی بە رێبازی (ریالیزم) براو دەیان رۆماننوسی مەزنی وەک ، ستاندال، فلوبیر، دیکنز، تۆلستۆی، گۆگۆڵ و دۆستۆیێفسکی، جیهانێکی ژیان ئاسای بۆ ئەو ئەدەبە خولّقاند.

ریالیزم پتر خەستبوویەوە لەناو ژیاندا، گەیشتە ئاستی سروشتی، بە تایبەت لە سەردەستی نووسەرانی پێشەنگی وەک (ئەمیل زۆلا) و ... هتد پاشان لە ریالیزمی نوێدا کە پتر گرینگی بە نوێخوازی فۆرمی ریالیزمی دەدا، نموونەشمان شاکارەکانی بروست، جۆیس و کافکایە.

گۆرانکاری لە هەردوو لایەنی پێکهێنەریدا، چ ناوەرۆک و چ شێوە روویدا، یەکێک لەو شێوازانە بریتی بوو لە (نەو رۆمان) واتە رووکردنە نووسینی درێژەچیرۆک، یان بلّێین چیرۆکی درێژخایەن، کە شۆڕبوونەوەیە بە دیراسەکردنی رەوشت و خوو، شرۆڤەکردنی هەست و نەستی کەسایەتییەکان ، ئەمە خۆی لە خۆیدا یەکێکە لە رەوت و تەوژمە پەخشانئامێزە نوێیەکانی فەرەنسا. ئەمانە دەهاتن جیهانی بابەتەکەیان دەئاخنییە دووتۆی نووسینێکی راستەقینەی فۆرمدا، ئەمە لە بری گێڕانەوەی ئاساییانە، یان گێڕانەوەی ئەو جۆرە مێژووانەی کە لە رۆماندا باو بوو.

دەبیٚ ئاماژە بۆ ئەوەش بکەین کە کورتە رۆمانیش هاتە ئاراوە کە لە رووی قەوارەوە کەمێک لە چیرۆک درێژتر بوو، بەلاّم نەدەگەیشتە قەوارەی درێژە رۆمان، بە خێرایی رووداوەکانی رادەبوردن و گەلێکیش بە کورتی، جگە لەوەی ژمارەی کەسەکان، یان پالّەوانەکانییەوە کەمتر و چڕتر بوو، وەک بەرهەمەکانی (شۆلۆخۆف) بۆ نموونە رۆمانی (چارەنووسی ئادەمیزاد)، هەروەها رۆمانی (شێخ و دەریا) ی هەمەنگوای.

وابزانم ئەوەی باسمان کرد، لە پێشەکی ئەم رۆمانەدا (سێگۆشەی سنوور) ی مامۆستا سەلام عەبدوڵڵا، تەنها وەبیرخستنەوەیەکی پێویست بوو، هەرچەندە کورت بوو، بەڵام چڕوپڕ بوو. سەبارەت بە رۆمان لە لای ئێمەی کورد ، دەتوانین بڵێین ، مێژوویەکی ئەوتۆی نییە، بەش بەحاڵی خۆم لە لام ئاشکرایە کە چیرۆک بە واتای (حەقایەت) گەلێک دێرینە ، چ بەیت و چ ئەفسانە، ئەوە رەنگە نەک هەر لە گەلە دێرینەکانین، بەڵکو زیادەڕۆیی نییە کە بە دەنگی بەرز بڵێم: لە گشت گەلانێ دەوڵەمەندترین، ئامادەشم گەر نەیارێ بە هەڵەی دانام ، ئەوا بێ سێ و دوو لە زەریایەکی حەقایەت و ئەفسانەی کوردیدا نوغرۆی بکەم.

بەلایەنی رۆمانەوە، ئەو سەرەتایانەی ناسیومن زۆر پتر نین لە نیو سەدەیەک، ئەوە قەڵای دم دمەکەی (عەرەبی شەمۆ) و پێشمەرگەی (رەحیمی قازی) و ژانی گەل ی (ئیبراهیم ئەحمەد) و پاش ئەوانە ژمارەیەک لە رۆمانەکانی: (محەمەد مەولوود مەم) و (حوسێن عارف) و (خەسرەو جاف) و ... هەتا ئەم چەند ساڵانەدا (عەتا نەهایی) و (شێرزاد حەسەن) و پاشان (بەختیار عەلی) هاتنە مەیدانەوە.

دیارە چەند هۆکارێک لە پشت ئەم دەگمەن و دانسقەیی رۆمانی کوردەوە هەیە کە جۆرێکی نوێیە ، هاندەرە بۆ پەرەسەندن و گەشەکردنی، بە حوکمی ژێردەستەییمان نەبووە، دیارە هەناسەدرێژی و وزەی زۆری دەوێ، بۆیە کورد وتەنی خواردنێکی هەروا (نەرمە قووت ) نییە و چەند هۆی دیکەش هەن.

مامۆستا سەلام عەبدوڵڵا و رۆمانی سێگۆشەی سنوور :

دەبێ ئەوە بڵێم ، هەرجۆرە نووسینێکی ئەم ئازیزەم بەرچاو کەوتبێ، هەر لە یەکەم وشەو رستەیەوە، بە ئەندازەیەک کارم لێ دەکات، ناچار دەبم دەستی لێ هەڵنەگرم و بەردەوام بم لە خوێندنەوەیدا. خوێندنەوەیەکی یەک نەفەسی، ئەوە نهێنی و هونەر و جادووی ئەم نووسەرەیە کە ئەوە مەرجێکی گەوهەرینی نووسینە، بە تایبەت رۆمان. جگەلەوەی گیانێکی تەنزئامێزی رەوانی دوور لە (زۆر لەخۆکردن) راستەوخۆ کە لە تەک هۆشی دا، دەدوێ و پێبکەنێ دەبەخشێ کە هەمیشە پێکەنینە لە مشتی قووچاوی پەستی و تووڕەبووندا،

له نووسینەکانیدا دەبینرێن. له ڕووی زمانەوە، که زمان به لای منەوە، یەکێکه له بەها و بایەخە پرشنگدارەکانه و زیندووترین زەبری کارتێکردن و بزواندنه، دەبینین به زمانێکی سانا و ئاسایی کوردەوارییانەی دوور له قۆرت و قورسی و پێچه به دەورەو تەمومژەو پارێزراوه له پەلهاویشتنی زمانانی دەورووبەر و داگیرکەران. له هەمووشی گرنگتر ئەوەیه کاتێ هەر کەسایەتییەک له کەسەکانی که دەدوێ له دووتۆی گفتوگۆ، یان دیالۆگەکاندا، بەو زمانه دەدوێ که زادەی لایەنەکانی کەسایەتییەکەیه، تایبەتیشه به ژیانی ڕۆژانەو باریدەورووبەرەکەیەوە. هەر بۆیه توانیویەتی یەکانگیریی توندو تۆڵ له نێوانی ناوەوەو دەرەوەدا بنەخشێنێ و بتوانێ بەر له دەرەوەی وێنەیەکی ڕاستگۆیانەی ناخ بکێشێ.

هەر له ڕێگای ڕووداوەکانەوە بەره بەره ئاشنای بار و لایەنەکانی کەسایەتییەکان دەبین. دیاره نووسەر، هەروەک ئەندازیارێکی چاپووک و تەواو شارەزا، ئەندازەسازی خۆی له بونیادی بەشەکان و کۆی بەدەنی ڕۆمانەکەدا نواندووه.

کاتێ لەسەرەتاوه به نیازی پێناسەی ئەم ڕەگەزه ئەدەبییه، به بەیتئامێزمان ناساند، لایەنێکی دیار و گەوهەرینی بەیتئامێزیی ئەو شێوازەیه. له ڕووی وەدەرخستنی ڕاستییەکانەوە، له تەک شێوازی شیعرئامێزدا نییه، چونکه هەروەک خۆی چۆنه، ئاوەها وێنه ڕاستەقینەکەی به گشت ڕووه هەستییەکەیەوە دەینوێنێ و پێشکەشی دەکات. له ڕوویەکی دیکەوە، شێوازی گێڕانەوه باڵ به سەر باسی بابەتەکەدا دەکێشێ. واته هەواڵی ڕووداوەکان دەگێڕێتەوە، هەرچۆن له حەقایەتەکاندا پەیڕەو کراوه.

نووسەر له تەک ئەو گێڕانەوەیەدا و له شوێنی خۆیدا دەمەتەقێ، یان دیالۆگی بەکارهێناوه ، بەکارهێنانی گفتوگۆ بەو شێوازه پوخت و دراميیه که جگه لەوەی له تەک دیالۆگەکاندا، ئاماژەی بۆ کاردانەوەی قسەکان له سەر هەستی وتووێژکەرەکان، به جوانی داوه، ئیدی به جووڵه بێ یان به ڕەنگ و ڕوخسار و هەڵچوونی دەروونی.

لێرەدا نموونەیەک دەهێنمەوە:

((- ڕەنگە پاش ماوەیەکی تر یەکە یەکەمان بانگ بکەن بۆ لێپرسینەوە.

- پاشان چاوی بەناو هەمووماندا گێڕاو وتی: بۆیە پێویستە کەس ناوی خۆی نەڵێ و تا دەشتوانێ کەمترین زانیاری بدات.

- شێخ سدیق کە زۆر هاتبووە پێشەوە دەیویست بە باشی لە وتەکانی بگات، وتی: ئەی ناوی خۆمان نەڵێین، چی بڵێین؟

- مەبەستی ئەوەیە ناوەکەی خۆت بگۆڕە تۆ ناوێکی تر.

- شێخ سدیق بە سەرسووڕمانەوە تێیدەڕوانی، بۆیە مامۆستا عەزیز وتی:

- تۆ ئێستا شێخ سدیق نیت ؟

- ئەمیش یەکسەر وتی: بێگومان.

- ئەویش زۆر بە جدی وتی:

- دەی بڵێ شێخ سادق و بڕایەوە.

هەرچەندە کاتی پێکەنین نەبوو، بەڵام نەمانتوانی خۆمان رابگرین و لە ژێرەوە پێنەکەنین. خەسرەو هیچ بەو نوکتەیە پێکەنینی نەهات، تفەنگەکەی هەڵگرت و چووە شوێنی میحراب و لەوێ بە تەنها لێی دانیشت، هەر خێرا چوومە لای و لێم پرسی : ئەی هیچی تریان نەوت؟

خەسرەو داوای جامێ ئاوی کرد، کە خواردیەوە سەیرێکی قووڵی کردم و وتی:

- نەموت ئەمانە گومان لە من دەکەن.

هیچم نەوت، لە راستیدا نەمدەزانی بڵێم چی.))

لایەنێکی دیکەی هەرە دیاری، دەسترەنگینی و خەیاڵ فراوانی و توانای وێنەکێشانی هونەرمەندانەیە، ئەویش لایەنی وەسفکردن ، نەک سەرپێیی یان کتومت فۆتۆگرافی، بەڵکو ئەفراندن ، ئەویش بە شێوازە تایبەتمەندییەکەی

باسەکان دەبنە بزوێنەری سەرجەم هەستەکان، کە دەستبەجێ بە خوێنەر یان بیسەر دەگات. بۆ نموونە کاتێ باسی سەرماو سۆڵە و تووشیی ئەو زستانە سەختەی سەر چیای کوێستانەکانی قەندیل ئاسا دەکات، لرفە لرف و هەڵلەرزین و زریان و کزەبای تەزێنەر، ئەوە وێنەو ئەوە دەنگ و ئەوە هەستی سەرمابوون و ... واتە لە یەک کات و یەک ساتدا، هەر پێنج هەستەکەی مرۆڤ دەبزوێنێ و دەهەژێنێ. با سەرنجی ئەم نموونەیە بدەین:

(( چ شەوێکی بێ کۆتایی بوو، هەر رۆژ نەدەهات. هەموو لە سەرماندا هەڵدەلەرزین و خەویش تینی بۆ هێنابووین، بەڵام کەسمان نەماندەتوانی بنووین. زەوی ژێرمان تەڕ بوو، ژێر چادرەکەش بووبوو بە ئاو. ویستم برێک پاڵ بکەوم، بەڵام بە هیچ جۆرێک بۆم نەدەرەخسا. ناچار تا رۆژ بووەوە هەر وەنەوزم دەدا. ئەوانیش هەروەک من وا بوون.

کەسمان لە سەرما قسەمان پێ نەمابوو، هەموو چاوەڕێی رووناک بوونەوە بووین.

ئای لە درێژی شەو ، کاتێک چاوەڕێی رۆژبوونەوە دەکەیت.))

بەلای منەوە راستگۆیی لە دەربڕین و گێڕانەوەدا مایەی ئەو کاریگەرییەیە کە زامنکەری سەرکەوتنە، بە تایبەت لە رۆمانێکی وەک ئەم رۆمانی (سێگۆشەی سنوور)ەدا، کە دەچێتە خانەی سەربوردەنامە، یان رۆمانی یادەوەری و لە چوارچێوەی رۆژانێکی سەختی نووسەرەکەیدا، کە خودی خۆی پاڵەوانێکی سەرەکی رۆمانەکەیە، سەرەتای لە کوێرەوەری بەندیخانە تۆقێنەرەکەی (هەینە)ی رژێمی بەعسی مرۆڤکوژەوە چەکەرە دەکات، نووسەر ئەو مرۆڤەیە کە هەر دەڵێی بۆ خەبات دروست بووە. بۆیە دەبینین هەر پاش هەڵاتنی لەو زیندانە هەرەترسناکەوە بەوپەڕی جەربەزەیی و چاونەترسییەوە هەڵدێ و روو دەکاتە چیا بۆ خەباتی چەکداری و سیاسی ، بەڵام مەزنێتی هەڵاتنەکەی دروستبوونەوەیەکی نوێیە لە ژیانیداو بوون بە پێشمەرگەش، ئەوە پلەیەکی باڵای هەڵکشانی کەسایەتییەکەیەتی، هەروەها لە دووتۆی ئەم هەڵکشانەدا، یان لە تەک هەر هەنگاوێکی ئەو رێگاو رۆژە سەختانەدا، چێژی زانیارییەکی فرە

بە خوێنەر دەبەخشێ، چ لە ڕووی باری سیاسی کوردستان و چ دیراسەکردنی هۆکارە گەوهەرینەکانی سەرجەم نوشستییەکان کە لە گشتیاندا، یان زۆربەی هۆکارەکانی هەر ناوخۆیی بوون.

گوندنشینان چ بە ڕەوشت و هەڵسوکەوت و پەیوەستی بڕوادارانەیان ، بە باوەڕی کوردەوارییانە و کوردپەروەرییانە، بە وردی لایەنە ئەنتۆگرافییەکانی کۆمەڵگای خۆیان دەرخستووە، لەو ڕێگایەوە ئاستی ستەم و کوێرەوەرییەکانی نوواندوون کە ڕژێمە بەربادەکان چییان بەم گەلە کردووە. نووسەر بە گشت کەرەسەیەکی هونەری داکۆکی لە کەرامەتی مرۆڤی کورد و بە تایبەت پێشمەرگەکانی کردووە، لە گشت تەنگەشەکاندا، دەوری سەرفرازی لە باری بینیوەتەوە بۆیان، بە بێ ئەوەی کەسەکانی گرفتاری ڕۆچوون و نائومێدی و ورە ڕووخان بکات. بۆیە دەتوانین بڵێین لە تێکڕای ڕووداو و تەنانەت کارەساتەکانیشدا، تەنها ئاوازێ کە دەشنێ و دەژی، کە ئاوازی سەرەکی ڕۆمانەکەیە، ئەویش بریتییە لە هیوای ژیانی سەربەستی و عەودالیی ئازادییە.

لەم ڕۆمانەدا هێڵێکی شێوە درامی سەرەکی هەیە کە پێشتر بە چەند بەشێک وەک پێداویستییەکی ڕۆمانەکە یان ڕێگاخۆشکەر و پێناسین هەیە، هەتا دەگاتە گەیشتنی نامەکەی (شەهید ئارام) لە ڕێگای (شەهید مامۆستا عەزیز)ەوە، ئیدی لەو ساتەوە دەستنیشانی مەبەست یان فەلسەفەی نووسینی ڕۆمانەکە ئاشکرا دەبێ کە بریتییە لە گەیشتن بە سێگۆشەی سنوور، واتە ناونیشانی ڕۆمانەکە، بە مەبەستی گەیشتن بەو چەکانەیە کە لە سووریاوە دەبێ بگەن. کە لە سێگۆشەی ڕاستیدا، سێگۆشەی یەکانگیریی داگیرکەرانن. دیارە گەیشتن بەو شوێنە سەختە و لە هەمان کاتدا ئەو هێڵە بە کۆمەڵە وێستگەیەکدا ڕادەبوورێ و هێندەی دی هێزی وەدواکەوتن، یان گیانی چەشەکردن، مەزنتر دەکات.

کاتێ باس بێتە سەر باسی هەر ڕۆمانێکی مامۆستا سەلام، پێویستە باس لە تایبەتمەندییەکانی بکرێ، هەرچۆن ستایلی تایبەتی خۆی.

لایەنێ لە هەرە لایەنە دیار و زەقەکانی، یان خەستبووەوەکانی، گیانی

سینەمابیە. دەتوانین بە هەبوونی سیناریۆی سینەمایی لە ناخیدا بکەین هەر ئەمەیە وای لە من کردووە کە لە گەڵ خوێندنەوەیدا، زۆر بە روونی هەست بە نواندنی فیلمێکی سینـ ـیی بکەم.

دیارە سینەما هونەری وێنەی جووڵەدارە، جۆرێکە لە جۆرەکانی دراما، واتە چەندین توخم و بایەخی دراماتیکی تێدا کۆبووەتەوە.

لە هونەرە بەهێزەکانی دەربڕینە کە پتر گرنگی بە ناخ و هەڵچوونە دەروونییەکان و زەقکردنی کاردانەوەکان لە سەر فەرمانی دەرەوەی کارەکتەر و وێنەکێشانی وەسف و باسەکان بۆ بزواندنی خەیاڵ و خوڵقاندنی کەشی دەروونی، یان کۆکەشی دەروونی.

کەواتە زۆربەی ئەو خاڵە گەوهەرینانەی تیادا دەبینینەوە، ئەوە دیالۆگ بە گشت جۆرەکانییەوە، ئەو فرمان و رووداوەکان، گرێ و ئاڵۆزییان و بەرەوپێشەوەچوون بۆ کردنەوەیان، جگە لەوەی چیرۆک و بیرۆکەی سەرەکی و لاوەکی لە خۆ دەگرێ. هەروەها ئەو هێڵە درامییەی لە سەرەتاوە نەشونما دەکات تا دەگاتە ئاکام.

دیارە نووسەر، هەر وەک سیناریستێک ، لە رووی تەکنیکەوە هەر بەشێوەی پلان دانانێکی گشتی بۆ نووسینەوەی سیناریۆیەک ئەفراندنی نواندووە.

بێگومان ئەوپەڕی کارئاسانی بۆ دەرهێنەری سینەمایی، یان سیناریست پێشکەش کردووە. بەر لەوەی کۆتایی بە وشەکانم بێنم ، حەز دەکەم باسی ئەوەش بکەم کە رەنگە کەسانێ بپرسن : بۆچی هەندێ وشە یان رستە چەندبارە بووەتەوە، وەک ئەم رستەو حاڵەتانە، (کارێکی هەروا ئاسان نییە) و (پڕمەی وڵاخەکان) و ...

دەڵێم ئەمە پابەندبوونە بە چەندبارە بوونەوەی حاڵەتەکان و هەستە دەروونییەکانی کارەکتەرەکان و لە هەمانکاتدا جەختکردنە لەسەر شەکەتی و بێزاری دووبارەبوونەوەکان.

سەبارەت بە کۆتایی، کە لە لای من ئەو زرنگانە بزوێنەرە پڕ لە لەرینەوەو دەنگدانەوەیەیە، هەرچۆن لێدانی (سەنج)ی ئامێری درامس لە تەک کۆتایی هێنان بە سەمفۆنیا، یان ئاوازە میوزیکییەکە.

جوانترین کۆتایی کە دەڵێ:

( (ئێمە وڵاخەکانی خۆمان شەتەک دایەوەو لە گەڵ قافڵەکەدا بەرەو سنووری خۆمان بەڕێکەوتین .

کە سەردەکەوتین وتەکانی کوێخا موزەفەر لە گوێمدا دەزرنگایەوە:

_ قەت نەکەن رووی تفەنگ بکەنە یەکدی. نەکەن.))

بە ئومێدی وەرگرتنی چێژی ئەدەبیی لەم شاکارە ئەدەبییە باڵایەو سوپاس.

**ئەحمەد سالار**

**٢٠١٤/٤/١٠**

## ١

که بە گردی سەیواندا داگەڕاین، دەورووبەر تەواو تاریک بوو، ئەو دیو بە هۆی گڵۆپەکانی شاری سلێمانییەوە رووناک بوو، بۆیە بە ئاسانی رەوتمان دەکرد، بەڵام ئەم دیو _ بە تایبەت بۆ من _ گەلێک سەخت بوو، چەند جارێک هەڵنوتام و بە زەویدا کەوتم، بۆیە جوتیار، کە وەک ئاسک رەوتی دەکرد، بە ئەسپایی پێی وتم:

_ لە دوای منەوە برۆ.

لەراستیشدا هەر لە دوای ئەوەوە دەڕۆیشتم، بەڵام تاریکی بۆ من زۆر سەخت بوو، ئەو ماوەیەی زیندان و بێ خواردنی، کاری کردبووە سەر چاوم و تێکڕای جەستەم. سەیرم لە جوتیار دەهات کە وا تیژ دەڕۆیشت و هەنگاوی گورجی دەنا. برادەرەکەی ترمان کە خۆی بە فازیل ناساند ئەویش چاک هەنگاوی دەنا، لەوە دەچوو شارەزای دەرو دەشت بێت ، چونکە هیچ باکی نە لە تاریکی و نە لە بەرد و تەلاش و درک و داڵ هەبوو، هەر وەک کەروێشک قونەی دەهات. هەرچۆنێک بێت منیش بە دوایاندا دەڕۆیشتم و هەوڵم دەدا کە دوا نەکەوم.

بە جادەی نێوان عەربەت و سلێمانیدا پەڕینەوە. هیچ نەهاتە رێگامان، لەوێوە بە دەستی چەپدا رووەو شاخی گوێژە ملمان نا.

جوتیار هاتە لامەوەو وتی:

_ ئەم ناوچەیە زۆر ترسناکە، چونکە چەندین سەربازگەی رژێمی لێیە و جاروباریش کەمین دادەنێن، بەڵام من شارەزام ، خەمتان نەبێت.

ئەگەرچی کەسمان هیچمان نەوتبوو لەو بارەیەوە و بێدەنگ رەوتمان دەکرد، هەر ئەو دڵنیا کردنەوەیە بۆ ئێمە مایەی دڵخۆشی بوو کە بە دوای پێشمەرگەیەکی شارەزادا دەڕۆیشتین.

من هەر بیرم لای هەڤاڵانی زیندانی «هەیئە» بوو، دەبێ ئەوانە پاش راکردنی ئێمە لە چ بارودۆخێکدا بن، ئەمە ئەگەر مابن، چونکە رژێم بە دڕندەیی ناسرابوو بۆیە ناکرێ لە سەر راکردنەکەی ئێمە هەروا بێدەنگ بوو بێت.

مانگ لە پشت کەلی مەحموودخانەوە وردە وردە سەری دەردەهێناو ئەو ناوەی رووناک دەکردەوە. ئێستا لە گەورەیی و جوانی شاخی گوێژە دەگەیشتم، چونکە پێش هەڵهاتنی مانگ وەک دیوارێکی رەشی مەزن دەهاتە پێش چاومان .

هەرچەند تا سەردەکەوتین رێگاکەمان دژوارتر دەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا، بە هۆی تریفەی مانگەوە، بەرپێی خۆمان بە روونی دەبینی.

لە زیندانەوە بۆ شاخ کارێکی هەروا ئاسان نەبوو، مرۆڤ لە زینداندا بە هۆی نەجووڵانییەوە، لاواز و بێهێز دەبێ بە تایبەتی لە زیندانێکی نهێنی وەک هەیئە کە سەرباری نەهێشتنی هاتنە دەرەوەمان بۆ مەیدانی زیندانەکە، وەک هەموو زیندانێکی تر کە مۆڵەتی بە زیندانییەکان دەدا بۆ ماوەی کاتژمێرێک، رۆژانە، لە دەرەوەی ژووری زیندان پیاسە بکەن، ئەمە لە «هەیئە» نەبوو.

هەیئە زیندانێکی شاراوە و ئەشکەنجەگای خەباتگێڕانی گەلی کورد بوو.

لەوێ، هیچ یاسایەک، جگە لە یاساکانی خۆیان هیچیتر نەیدەخوارد، یاسای بەعسیش تەنها ئازارو لێدان و کوشتنی نهێنی بوو.

جوتیار هەستی بەوە کردبوو کە تەواو هیلاکم، چونکە خیزەی سنگم بە ئاسانی دەبیسترا و هەناسەبڕکێم دۆخی لاوازیی جەستەمی دەدرکاند، بۆیە هاتە لامەوەو وتی:

_ با پشوویەک بدەین.

چ هەواڵێکی خۆش بوو، چونکە خۆم شەرمم دەکرد ئەو داوایە بکەم، بۆیە یەکسەر لە سەر گاشە بەردێک بۆی دانیشتم.

ئێمە گەیشتبووینە نیوەی شاخەکەو لەوێوە بە ئاسانی رووناکی ئاسمانی سەر سلێمانیم بەدیدەکرد. تۆ بڵێی جارێکیتر بیبینمەوە، چۆن بتوانم سەر لەو شارە بدەمەوە کە دەسەڵاتدارانی، فەرمانی لە سێدارەدانیان دابووم و منیش هەڵاتوویەکی زیندان بووم.

فازیل، ئەویش وەک من، شەکەت بووبوو، دەستی کرد بە گیرفانیداو جگەرەیەکی دەرهێنا، کە خێرا جوتیار دەستی گرت و وتی:

_ نەکەی بۆ خاتری خوا، لە رەبییەکانەوە دەبینرێین.

سەراپای شاخی گوێژە هەمووی رەبایا بوو ، بەڵام رەبایاکانی سەر لووتکەکان، وەک جوتیار وتی: هەموو رۆشناییەکیان لەو بنار شاخ و رێگاوبانەدا بەدی دەکرد.

پاش پشوودانێک کە بۆ من زۆر پێویست بوو، کەوتینە رەوت و وەک جوتیار بۆی روون کردینەوە ، بەرەو گوندی (وێڵەدەر) دەچووین.

تا زیاتر سەردەکەوتین رێگەکەمان تەواو سەختتر دەبوو، من بیرم بۆ لای خەڵکی گوندەکانی خۆمان دەچوو، کە رۆژانە بۆ هاتنە نێو شار، ئەو رێگایانەیان دەبڕی، چونکە هیچ رێگایەکی ئۆتۆمبێل بۆ ئەو گوندی سەر شاخانە نەبوو.

لە نیوەشەودا چراکانی گوندی وێڵەدەر دەرکەوتن، ئاهێک بە گیانمدا هاتەوە . هەستم بە برسییەتی و تینوویەتییەکی یەکجار زۆر دەکرد. بۆ لەگەڵ خۆمان تۆزێک ئاو و چەند بابۆڵەیەک نانمان هەڵنەگرت! خۆ لەم گوندانە رێستۆران و جێی حەوانەوەی گشتی نەبوو، بۆ جوتیار بیری لەوە نەکردبۆوە؟

کە گەیشتینە نێو گوندی وێڵەدەر، لە سەر دەستووری پێشمەرگە چووینە ماڵێک، ئەگەرچی هەمووش خەوتبوون، بەڵام بەخەبەر هاتن و خێرا کەیبانووی ماڵ نان و چایی بۆ ئامادە کردین.

شانم بۆ دادابوو، خەو تینی بۆ هێنابووم، چونکە پێڵووەکانم تا دەهات قورستر دەبوون، بە هەموو حسابی خۆم، رەوتی ئەم شەوەمان بە کۆتایی هێنابوو، بەو پێیەش دەبوو لەم گوندە لابدەین، بەڵام وەک من چاوەڕوانم دەکرد، وا دەرنەچوو، چونکە جوتیار بە دەنگێکی بەرز، بە ناوی هەموومانەوە سوپاسی ئەو میواندارییە ناوەختەی لێکردن، بۆیە منیش بێ سێ و دوو هەستامە سەر پێ و ئامادەی رۆیشتن بووم.

*** 

## ٢

من وامزانی (وێڵەدەر) دوا مەنزڵمان دەبێت و ئێمەش شەو لەوێ دەمێنینێنەوە، بەڵام وادەرنەچوو، چونکە دەلیلەکەمان ئاگاداری کردینەوەو زۆر بە ئەسپایی پێی وتین:

ـــ دەبێ بڕۆین، ئێرە بە کەڵکی مانەوە نایەت.

هیچی تری نەوت. هەرچەندە من زۆریش هیلاک بووم و خەوم دەهات، بەڵام ناچار بووم، بۆیە منیش بێ قرپە دوایان کەوتم.

کە لە گوندی وێڵەدەر دوور کەوتینەوە، ئەو تۆزە تروووسکاییەش نەما، کە لە چرای ماڵەکانەوە دەبینرا پەڵە هەورێک بەری مانگی گرت ، بۆیە نوقمی تاریکی بووین و من هیچم نەدەدی و تەنها بە خشەخشی پێکاندا هەستم بە بوونی ئەوانیتر دەکرد. ئێمە سێ کەس بووین، جوتیار کە پێشمەرگە و دەلیلەکەمان بوو لە پێشەوە ڕەوتی دەکرد، فازیل کە ئەویش دەیویست ببێ بە پێشمەرگە لە پشتییەوە دەڕۆیشت و منیش لە دوایانەوە.

ئێمە گەیشتبووینە سەری شاخی گوێژە و وێڵەدەرمان بەجێهێشتبوو

که جوتیار رایگرتین و هەر بەو تاریکییە پێی وتین:

_ ئیتر داگەڕانە، زۆر ئاگاتان لە خۆتان بێت، بە ئەسپایی بڕۆن و تا دڵنیا نەبن هەنگاو مەنێن.

لەراستیدا جگە لە ئەستێرە دوورەکان کە لە ژوور سەرمانەوە بە ئاستەم دەبینران، من هیچم بەدی نەدەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا دەقاودەق قسەکانی جوتیارم جێبەجێ دەکردو زۆر لە سەرخۆ هەنگاوم دەنا. من وام دەزانی سەربەرەوخواریێ گەلێک لە سەرکەوتن ئاسانتر بێت، بەڵام ئەویش وادەرنەچوو، چونکە ئەژنۆکانم خەریکبووین لە جومگە دەربێن. جا لە بەر ئەوە بووبێت کە هێشتا شارەزاو راهاتوو نەبووم، یان هەر داگەڕان کارێکی سەخت بوو، هەر کامیان بێت بۆ من زۆر ئەزیەت بوو.

من لای خۆمەوە نەمدەزانی کەی دەگەینە جێگەی مەبەست و بە پێویست و باشیشم نەدەزانی ئەو پرسیارە لە جوتیار بکەم ، بەڵام لە دڵەوە خوازیاری ئەوە بووم کە هەرچی زووترە بگەینە شوێنێک، پشوویەک بدەین و سەرخەوێک بشکێنین. ئەو تینوویەتییەش لەولاوە بوەستێ کە تەواو تامەزرۆی قومێک ئاوبووم بەڵام ئاو لەو شاخە رەق و بەردەڵانییە و بەو شەوە تاریکە پەیدا دەبوو؟

نەمزانی چەندە بەڕێوەین، بەڵام هەستم دەکرد کە خەریکە سەرەوخواریەکە تەواو ببێت، چونکە لێژایی داگەڕانەکەمان وەک ئەوەی سەرەتا نەبوو، لەوە دەچوو ئیدی بەرەو تەختایی بڕۆین.

که بەتەواوی لەشاخەکە هاتینە خوارەوە، جوتیار فەرمانی پێداین:

_ بوەستن، وا نزیک جادەی (دوکانیان) کەوتووینەتەوە.

ئەوەی وت و لە شوێنی خۆی وەستا. کە بە تەواوی لێی نزیک کەوتمەوە وتی:

_ دەبێ بە زووترین کات لەم جادەیە بپەڕینەوە، چونکە مەفرەزە سەربازییەکان بە شەو هاتوچۆی پێدا دەکەن.

لە دڵی خۆمدا وتم، جا بەم شەوە تاریکەو لەناو ئەو بەرد و تەڵاشانەدا، کێ کێ دەبینێ؟ بەڵام ئەمەم هەر بۆ خۆم وت.

بۆ ماوەیەک نزیک جادەی (دوکانیان) خۆمان مەڵاس دا، کە هیچ دەنگێک نەبوو، جوتیار فەرمانی پێداین، کە بە راکردن جادەکە ببڕین و بچینە ئەوبەر، هەر واشمان کرد. هەناسەیەکی دوورودرێژم هەڵکێشا کە نیشانەی ئاسوودەیی بوو. بەراستی هیلاک و شەکەت و تەواو ماندوو بووم. لە رووشم نەدەهات ئەوە بدرکێنم و پێیان بڵێم کە با پشوویەک بدەین، چونکە وەک جوتیار بۆی باسکردین، شوێنەکە گەلێک ترسناک بوو، مەترسی ئەوەش هەبوو گەر پشوو بدەین، رۆژ بێتەوە ئیدی بەو پێیەش لە رەبایای سەر شاخەکانەوە بە تایبەتی رەبایاکانی سەر شاخی گۆیژەوە ببینرێن، بۆیە بێ ورتە هەرچەند تەواو بێ هێزیش بووم هەر بە دوایانەوە، رووەو سەرو، منیش سەردەکەوتم. گەر ژیانی پێشمەرگایەتی و پارتیزانی بەمشێوەیە بێت دەبێ گەلێک سەخت بێت.

تینوویەتی تەواو تینی بۆ هێنابووم، بۆ لە بیرم چوو! پەلەپەلی جوتیار بوو کە ئەو شەوە زۆری پەلە بوو، یان ئەویش وەک من بیری چوو. چۆن مرۆڤ بەم شاخ و دۆڵەدا بڕوا بە بێ مەتارە. خۆ من هەمیشە دەمبیست کە مەتارە بە قەدەر چەک بۆ پێشمەرگە گرنگە.

زۆرم سەرکۆنەی خۆم کرد، بەڵام ئایا ئەوە هیچ سوودی هەبوو،

تینوویەتی دەشکاند؟

لەمبەر، جوتیار وەک ئەوبەر پەلەی نەبوو، رادەوەستا و پێی دەوتین کە دەتوانین پشوو بدەین، هەر واشمان دەکرد، دیار بوو ئەمبەر وەک ئەوبەر مەترسیدار نەبوو، بەڵام کەی دەگەینە شوێنی حەوانەوەیەک، کەی تۆزێک ئاو دەخۆینەوە، کەی رادەکشین.

لە سەرکەوتندا بووین، هەستم کرد فازیلیش وەکو من شەکەت دەنوێنێ، ئیتر دەشمانوێرا کەمێک پێکەوە گفتوگۆ بکەین بۆیە پێم وت:

_ چۆنی لەگەڵ سەرکەوتندا؟

ئاوڕی لێنەدامەوە، گەر بشیکردایە بۆ من لەو تاریکییەدا هەر وەک یەک بوو، لە وەڵامدا وتی:

_ بڕوا بکە زۆر لە تۆ هیلاک ترم، بەڵام تازە چارمان چییە، هەر دەبێ بڕۆین.

دیسانەوە پرسیارم کردو وتم:

_ئەی کەی دەگەین؟

بۆ کوێ؟

وەڵامێکی راستی دامەوە، ئێمە بۆ شوێنێکی دیاریکراو نەدەچووین. پێشمەرگە شوێنی زانراو و دیاریکراوی نەبوو. دەبوو ئێمە بە شوێن ئەواندا بگەڕێین و بیاندۆزینەوە و پەیوەندییان پێوە بکەین.

هیچ پرسیاری ترم نەکرد. سەرەوژوور ملمان دەنا، ترپەی دڵم بە ئاسانی دەبیسترا. بن پێم ئازاری دەهات کە ئەو تەڵاشە بەردە تیژانە

لە بن پێم دەچەقین تەزووی ئازار بە هەموو گیانمدا دەهات، پێڵاوی لاستیک دادی نەدەدا.

هەستم کرد کە جوتیاریش وەک ئێمە هیلاک بووە، چونکە ئەویش هەنگاوەکانی وەکو سەرەتا گورج نەدەنا.

هەرچۆنێک بێت گەیشتینە سەر شاخەکەو لەوێ هەست بە تەختایی دەکرا. جوتیار لە شوێن خۆی دانیشت و وتی:

_ ئەمشەو ئیتر ناگەینە هیچ شوێنێک، تەواو ماندوویشین، بۆیە هەریەکەو لەپاڵ گابەردێکدا با سەرخەوێک بشکێنێ تا بەرەبەیان و دونیا ڕووناک دەبێتەوە.

بەراستی هەواڵێکی خۆش بوو، بۆیە منیش بێ گەڕان بە دوای هیچ گابەردێکدا یەکسەر لە شوێن خۆم بۆی ڕاکشام.

***

٣

لە چووقەچووقی ددانەکانم بە ئاگا هاتمەوە، لەشم هەمووی هەڵدەلەرزی، سەرم دێشا، سەیری دەورو پشتی خۆم کرد، دنیا رووناک ببووەوە، جوتیار لە خەو هەستابوو ، یان هەر نەنووستبوو، چونکە خەریکی پاککردنەوەی دەمانچەکەی بوو، فازیل لە سەرما خۆی گلۆڵە کردبوو، بەردێکی کردبوو بە سەرین. هەستم کرد کە هەموو گیانم رەق هەڵاتبێت. ئەگەرچی مانگی سێپتەمبەریش بوو، بەڵام سەر ئەو شاخە کوێستانێکی راستەقینە بوو. جوتیار سەری هەڵبڕی و وتی :

ـــ دەبێ بە زوویی لێرەش تێپەڕبین و بچینە دیوی ئەدیو، لێرەوە ئیتر رەبایەکان دەمانبینین.

ئەمەی وت و ئیشارەتی بۆ رۆژهەڵات کرد. رەبایەکانی رژێم لە سەر لووتکە بەرزەکانەوە بە ئاسانی دەبینران. لە راستیدا لە شوێنێکی مەترسیداردا، ئەو شەوە، لاماندابوو. جوتیار هەستایە سەرپێ و وەک مەشقی وەرزشی بکات هەندێک باسکی راوەشاند و چەند جارێک خۆی بەرەو زەوی نووشتانەوەو پاشان لە سەر هەردوو پێی کەوتە هەڵبەزینەوە، بۆیە من بە سەرسووڕمانەوە سەیرم دەکرد. لە دڵی

خۆمدا دەموت، ئای لەو تاقەتە! لەوە دەچوو جوتیار هەستی بە سەرسامیم کردبێت، چونکە بە دەنگی بەرز بۆ ئەوەی فازیلیش خەبەر بکاتەوە وتی:

_ ئەو خۆ بزواندنەو خۆ راوەشاندنە بۆ پارتیزان، گەلێک پێویستە، رەقی و سستی جەستە دەورووژێنێت لەشیش گەرم دەکاتەوە.

فازیلیش هەستا، ئەویش چەند جارێک بەراست و چەپی خۆیدا پشتی تەقاند و پاشان هەستایە سەرپێ. من زۆرم تینوو بوو، هەرچی سەیری دەورو پشتیشم دەکرد لە تاوێرە بەردو گابەرد و تەلاشی تیژ و دەوەنی چڕ ، هیچی ترم نەدەدی بۆیە بە جوتیارم وت:

_ کەی دەگەینە ئاو؟

لە وەلامدا وتی:

_ هەر دەگەین.

وەلامێکی پێشمەرگانە بوو، چونکە نە کاتی دیاری کردو نە شوێنیش! بۆیە منیش بێدەنگ بووم. لەم کوردستانە شیرین و رەنگینە هەر ئاو زۆرە، بۆ وا لە ئێمە هاتۆتە قاتی؟

سەربەرەوخوار، جوتیار لە پێشەوە، ئێمەش لە پشتیەوە کەوتینەوە رێ. بە رووناکی رەوت زۆر ئاسانتر بوو. لە شاخە دوورەکانی رۆژهەلاتمانەوە، کە وەک تەم دەبینرا، خۆر تۆزە تۆزە سەری دەردەهێنا. دیمەنێکی دلڕفێن و تابلۆیەکی سروشتی بێوێنە بوو. تیشکی زێڕینی خۆر کە بەناو تەمی بەیانیدا تێدەپەڕی، دیمەنێکی خەیالاوی دەنواند. نیگارکێشێکی وەک (رینوار)ی دەویست کە بەرجەستەی بکات. تەزووی گەرما تا دەهات بەتینتر دەبوو، هەستم

دەکرد کە لەشم وردە وردە، لە ئەنجامی ڕۆیشتن و گەرمی خۆردا، تا دەهات نەرمتر دەبوو، بەو پێیەش تەزووی سەرما لە گیانمدا نەدەما.

کە کەوتینە نادیاری، جوتیار هەنگاوەکانی هێور کردەوەو وتی:

_ مەبەستم بوو زوو بگەینە ئەمدیو، بە ڕاستی ڕەبایەکان گەر هەستیان بە بوونمان بکردایە تەقەیان لێدەکردین.

منیش هەر بۆ دروستکردنی وتووێژێک وتم:

_ بەڵام خۆ ئێمە جارێ چەکدار نین، بۆ تەقەمان لێدەکەن؟

سەیرێکی قووڵی کردم. وەک پرسیارەکە چاوەڕواننەکراو بووبێت بۆی، سەری لەقاند و وتی:

_ ئەوانە گوێ نادەنێ، هەرچی لە سەر شاخ ببینرێت، بە یاخی بووی لە قەڵەم دەدەن.

یاخی بوو، زاراوەی بەعس بوو بۆ پێشمەرگە. هەر سەرەوخوار دادەگەڕاین، بێ ئەوەی ئەمجارە پرسیار بکەم بە خۆم چاوم بۆ ئاو دەگێڕا.

لە زۆر شوێنی کوردستاندا، وەک من دەمبیست، لە سەر شاخیش، هەندێکجار، ئاو پەیدا دەبوو، بەڵام لە شانسی ئێمەدا ئەم شاخە هەر بەردەڵان و دەوەن و ڕەقەنی بوو.

دەمەو بەیانی گەیشتینە تەختایی، لە دوورەوە خانووە قوڕینەکانی دێیەک بەدی دەکرا، تەزوویەکی خۆش بە گیانمدا هات، ئیدی دەگەینە ئاو. کە نزیک دێ کەوتینەوە، جوتیار وەک کارێکی گرنگی ئەنجام

دابێ _ که بەلای منەوە هەر وا بوو_ وتی:

_ ئەوەش دێی عازەبان.

ئەگەرچی من پێشتر ئەو دێیەم نەدیبوو، لەگەڵ ئەوەشدا ناوەکەی بۆ من نامۆ نەبوو. ئەو دێیە زادگای شاعیرێکی ناسراوی گەلەکەمان بوو کە بە شێخ سەلام ناو دەبرا. خاوەنی شیعری نەتەوایەتی هەست بزوێن و کوردانە بوو کە هەندێکم لە قۆناغی سەرەتاییدا لەبەر کردبوو.

دانیشتووانی گوندەکە وەک عادەتی هەمیشەیی، هەموو هەستابوون.

جوتیار دەمانچەکەی بە ئاشکرا کرد بە لاقەدیداو رووەو مزگەوتی دێ لە پێشمانەوە ملی نا. عادەت وا بوو، هەر لە سەرەتای شۆڕشی ئەیلوولەوە کە پێشمەرگە رووی دەکردە دێیەک یەکسەر دەچوونە مزگەوت، لەوێوە لە لایەن کوێخا یان گەورەی دێوە ، تەوزیع دەکران.

یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی پێشمەرگایەتی لە کوردستان، کە جیای دەکردەوە لە شۆڕشگێڕانی وڵاتانی دیکە، ئەم دابەشبوونە بوو، رەنگە لەبەر نەبوونی رێستۆران لەو گوندە بچووکانەدا بووبێ، یان هەر خودی کۆمەڵگای کوردی ئەو میواندۆستی و خزمەتی بیانی هەر لە کۆنەوە بۆ بەجێمابێت، هەر کامیان بێت، ئەم میوانداریيە، خزمەتێکی گەورەی بە پێشمەرگەکانی کوردستان دەکرد، کە دەکرێ بە شانازییەوە لای هەموو جیهان باس بکرێ.

لە مزگەوتی دێ، هەر خێرا، سەرو چاوم شت. کوپە ئاوێک لە سووچێکی حەوشەکەدا، کە کۆجیلەیەکی رەشی پێدا هەڵواسرابوو، سەرنجی راکێشام و هەر خێرا خۆم گەیاندێ. چەن کۆجیلەیەک ئاوم خواردەوە، هەستم دەکرد کە ئاوەکە چۆن بە گەرووی وشک هەڵاتوومدا تێدەپەڕێ

و دەیبووژێنێتەوە. مرۆڤ دەتوانێت چەند ڕۆژێک نان نەخوات، بەڵام ئاو... ئاو ناتوانرێت.

لە زیندانیشدا لە «هەیئە»، هەر مەراقی ئاوم بوو، گەورەترین ئەشکەنجە لای من بێ ئاوییە. کە ڕژێم لە زیندانە نهێنییەکاندا، وەک چەکێکی کاریگەر، دژی زیندانییەکان، بە کاری دەهێنا.

کە ئاوەکەم هەڵقوڕاندو ئاوڕم دایەوە، جوتیار لەگەڵ گوندییەکدا قسەی دەکرد و گوێم لێبوو دەیوت:

_ ئێمە تەنها سێ پێشمەرگەین.

کابرا کە لەمەودوا وەکو حاجی خۆی ناساند زۆر بە گەرمی بەخێرهاتنی کردین و وتی:

_ سەر چاوان

کەواتە ئێمە لەمڕۆوە، هەڵگری نازناوی شانازیهێنەری پێشمەرگەین.

***

## ٤

که له ماڵی حاجی هاتینه دەرەوە ، یەکسەر رووەو مزگەوت ملمان نا. مزگەوتەکە چۆڵ بوو، بۆیە جوتیار بە خۆشحاڵییەوە پێی وتین:

ـ دەتوانین تا پێشمەرگەکان دەگەڕێنەوە بۆ ناو دێ، لێرە تۆزێ پشوو بدەین. هیلاکی و شەکەتی شەو بە من و فازیلەوە بە ئاشکرا دیار بوو، هەر بۆیەش بە دانیشتنمان، یەکسەر شانم بۆ دادا.

نازانم چەند بوو نووستبووم کە جوتیار دەستێکی بە کەلەکەمەوە ژەند و بە دەنگی بەرز وتی:

ـ هەواڵێکی خۆش، پێشمەرگەکان گەیشتن.

بۆ من ، ئەو هەواڵە گەلێک شادیهێنەر بوو، چونکە ئیتر پێویست نەبوو ئێمە بە دوای ئەواندا بگەڕێین، چونکە دۆزینەوەی پێشمەرگە لەو شاخ و هەردو کێوە، کارێکی هەروا ئاسان نەبوو، ئەگەرچی ئەو کارە بۆ جوتیار زەحمەت نەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بۆ ئێمە، بە تایبەتی من، زۆر زەحمەت دەبوو. پێشمەرگە هەرگیز شوێنی خۆ شاردنەوەو حەوانەوەی خۆی بە کەس نەدەوت. رژێم سەربازگەو رەبایاکانی بە هەموو کوردستاندا بڵاو کردبۆوە، هەر بۆیەش نەدەتوانرا

بنکەی پێشمەرگە دابمەرزێ و بەو پێیەش، پێشمەرگە دەبوو هەمیشە لە جموجۆڵدا بێت کە بە زمانی پێشمەرگە پێی دەوترا، جەولە.

کە لە مزگەوتەکە هاتمە دەرێ ، پۆلێ پێشمەرگەم بە چەکەوە دی، لە پێشیانەوە ئەنوەری مەجید سوڵتان بوو، کە بە شێوەی پۆشینی بەرگی هەر لە گیڤارا دەچوو. قەمسەڵەی سەوزی سەربازی ئەمریکی، کاسکێتی رەشی سەربازی پیادەی عێراقی، مووی رەش و تەنکی سەروچاوی، کلاشینکۆفی حەفتاوپێنجی سەر شانی، روخساری شۆڕشگێڕێکی نموونەیی دەنواند. بەراستی بە بینینی دڵم گەلێک گەشایەوە، بۆیە یەکسەر باوەشم پێدا کرد و ناوچاوانیم ماچ کرد. من و ئەنوەر لە شاریش هەر برادەر بووین و ئاگاداری کاری نهێنی یەکتری بووین و چەند هەفتەیەکیش لە ماڵی ئێمە خۆی حەشار دابوو، تا ئەو شەوەی رەوانەی شاخمان کرد.

لەگەڵ پێشمەرگەکانیشدا مەراسیمی یەکترناسینمان جێبەجێکرد.

یەکێک لە پێشمەرگەکان زۆر بە وردی و بە قووڵی تێیدەڕوانیم. کە هەموو هاتینە ژووری مزگەوت بۆ پشوودان، هەر سەیری دەکردم و پاشان بە گوێی ئەنوەریدا چرپاند، ئەنوەر سەیری کردم و بزەیەک گرتی و بە دەنگی بەرز وتی:

_ خاڵە نەبەز ئەوە هاورێ (دارا) ی خۆمانە.

لە شاردا ناوی نهێنیم (دارا) بوو، نەبەز ناسیمیەوە پەلاماری دام و وتی:

_ تۆ کەی وا بوویت؟

مەبەستی سەروچاوم بوو کە لە کاتی گرتنمدا، لە سلێمانی، لە لایەن ئیستیخباراتەوە بە حەربە لێی درابوو، لە راستیدا ناهەقی نەبوو

نەمناسێتەوە. ئەو بە شێوەیەکی تر منی دیبوو.

هەموو پێشمەرگەکان تامەزرۆی بیستنی هەڵاتنم بوون لە زیندانی «هەیئە»، بە تایبەتی ئەنوەر و نەبەز، بۆیە منیش بە کورتی چۆنیەتی گرتن و راکردنەکەم بۆ باسکردن و پاشان وتم:

_ رۆژانمان زۆر لە بەردەمدایە، دەتوانم وردەکارییەکانی ئەو هەڵاتنەتان بۆ باس بکەم.

ئەنوەریش لای خۆیەوە باسی ژیانی پێشمەرگایەتی بۆ کردم کە رۆژانە چی دەکەن و بە چییەوە خەریک دەبن. هەموو زانیارییەکان نوێ و سوودبەخش بوون. ئەگەرچی من ساڵی حەفتاوچوار پێشمەرگە بووم لە هێزی ئازادی، بەڵام پێشمەرگایەتی ئەوکاتە وەک ئەمڕۆ نەبوو، ئەوسا دوو بەرە هەبوو، بەرەی حکومەت و بەرەی شۆڕش. بەڵام ئێستا زۆر جیاواز بوو، حکوومەت و سەرباز و بنکە و سەربازگەکانی لە هەموو شوێنێکی کوردستاندا هەبوون، هەر لە شارە گەورەکانەوە تا دەگەیشتە کوێرە دێکانی سەر سنوور، ئەو دێیانەی تەنانەت لە ئەتڵەسی عەسکەری ئینگلیزیشدا نەبوون.

زانیارییەکانی ئەنوەر، وەک ئەفسەرێکی عێراقی و وەک پێشمەرگەیەکی شۆڕشی ئەیلوول، زۆر ورد و پسپۆڕانە بوون. ئەنوەر هەم شارەزای عەسکەری، شەڕی نیزامی بوو، هەم پارتیزانێکی لێهاتوو و مرۆڤێکی یەکجار بە جەرگ و ئازا بوو.

سەبارەت بە ژیانی رۆژانەی پێشمەرگە وتی:

_ رۆژانە ئێمە جەولە لەناو ئەم دێیانەدا دەکەین، باسی نوێبوونەوەی، خەبات و شەڕی چەکداری دژی رژێم دەکەین. شەوانە دەچینە دەرەوەی دێ یان پەنا بۆ سەر شاخەکان دەبەین. هەموو پێشمەرگەیەک دەبێ حەراسەت بگرێ، کەمینی بەیانیشمان هەمیشە هەیە.

هەموو زانیارییەکان بە کەڵک بوون، مرۆڤ تابلۆیەکی راستەقینەی دەهاتە پێش چاو. ئەوەی لە کتێبدا دەخوێنرێتەوە، مەرج نییە لەگەڵ واقیعدا بگونجێ. ئەوانەی ئەنوەر باسیدەکردن لە ئەنجامی ئەزموونی پێشمەرگایەتی خۆی بوون.

لە مزگەوت هاتینە دەرێ. ئەنوەر پێی وتم:

_ نابێ لە هیچ شوێنێک لەوە زیاتر بمێنینەوە. دەبێ هەمیشە لە بزواندندا بین، خۆت بە چاوی خۆت، بێ گومان رەبایەکانت دی کە چەند نزیکن. سەرەڕای ئەوەش سەربازەکان رۆژانە بۆ ناو دێ دێن و ئاو بە وڵاخ بۆ رەبایەکان دەبەن.

بیرۆکەیەک هات بە مێشکمدا، هەرچەند من لە دەمانچەیەک زیاترم پێنەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا وتم:

_ ئەی بۆ کەمینیان بۆ دانەنێین؟

پەلەم بوو بۆ شەڕ یان پرسیارێکی ناشیانە بوو لە شۆڕشگێڕێکی خاوەن ئەزموون.

ئەنوەر پێکەنی، دەستێکی دا بە پشتمداو وتی:

_ پەلە مەکە. ئەوەش دەبێ، بەڵام لە ناو دێ نا.

***

## ٥

پێشمەرگە کاری ڕۆژانەیان بریتی بوو لە جەولە لە نێوان دێکانی (عازەبان) و (گورگەیەر) و (چنگیان). دێکان هێند لەیەک دوور نەبوون. گەر نانی نیوەڕۆمان لە عازەبان بخواردایە ئەوا بۆ ئێوارە دەچووینە (چنگیان). لەراستیدا چنگیان بۆ ئێمەی پێشمەرگە زۆر خۆش بوو، چونکە چەندین دوکانی لێبوو کە لەدێکانی تر نەبوون، ئەوەش بۆ ئێمە گەلێک پێویست بوو، بە تایبەتی بۆ کڕینی هەندێ پێویستی وەکو گۆرەوی و دەرپێ و فانیلە و پێڵاوی لاستیک و بنێشت و نوقڵ، بنیشت بۆ ئێمە زۆر کاریگەر بوو، تینووشکێنێکی بێ وێنەیە بۆ پێشمەرگە.

شوێنی هەڵکەوتی «چنگیان» بۆ ئێمە لەرووی عەسکەرییەوە زۆر بە بایەخ بوو، چونکە لە هەموو لایەکەوە بە شاخ دەورە درابوو، ئەوەش بۆ کاتی پێویست، بە تایبەت ئەوکاتانەی رژێم هێرشی دەکردە سەرمان، زۆر گرنگ بوو، چونکە بە ئاسانی خۆمان دەگەیاندە سەر لووتکەی شاخەکان.

ئەو پێشمەرگانەی لەگەڵ کاک ئەنوەر بوون، هەموو نزیکەی لە

تەمەنێکدا بوون، جگە لە یەکێک کە دیار بوو زۆر لە ئێمە گەورەتر بوو، خۆی وەکو عەبەی فارس ناساند. ئەو لەش و لاری لە پێشمەرگە نەدەچوو، زیاتر لە فەرمانبەرێکی بەساڵاچوو، یان لە ئاغای دێیەک دەچوو، رووخۆش و قسەخۆش، بەڵام شەکەت و بێ توانا دەهاتە پێش چاو ، ئەویش لەوەدەچوو هی کێشی قورسی بووبێت. هەر ئەمەش وای لێکردبوو کە زوو زوو برسی ببێت.

هەر بگەیشتینایەتە نزیک دێیەک ئیتر ئەو هەموو پێویستییەکی چێشت لێنانی لە دێکان پەیدا دەکرد، خۆشی دەبووە چێشتلێنەر. زەوق و سەلیقەی تەواویشی لە چێشتلێناندا هەبوو، وەک دەڵێن نانی بەدەستەوە دەخورا. ئەگەرچی بە فەرمانی کاک ئەنوەر نەدەبوو هیچ لە خەڵکی گوندەکان داوا بکرێت و تەنانەت خۆی کە لەو ماڵانەی تیا تەوزیع دەبوو، سوێندی دەخوارد کە نابێ نانی گەرم لێبنرێت و تەنها بە نان و ماست یان بە نان و سەوزە قایل دەبوو. بەڵام ئەوە بەسەر کاکە عەبەدا بەجێنەدەهێنرا. کاک ئەنوەر رێزێکی تایبەتی بۆی هەبوو. لەدانیشتنێکدا کە لەراستیدا پشوو بوو وتی:

_دەبێ رێزێکی زۆر لە کاکە عەبە بگرین ، چونکە تەمەنی لە هەمووان بەرەوژوورترە و سەرەڕای ئەوەش لە پیاوەتیدا تووشی پارتیزانی و ئێمە بووە.

زۆر لە دانیشتووانی شار ، ئەگەرچی سەر بە هیچ تەنزیمێکیش نەبوون، بەڵام ئەوانە هەر دالّدەی پێشمەرگەیان دەدا، کە بۆ چارەسەری نەخۆشی بەدزییەوە روویان دەکردە شار، یان چەک و تەقەمەنییان لە شارەوە، بە نهێنی بۆ لای پێشمەرگە دەگواستەوە. زۆر لەوانە ئاشکرا دەبوون و لە لایەن رژێمەوە دەستگیر دەکران و لەمەودواش لەسێدارە دەدران، چونکە لای بەعس هەرچی هاوکاری پێشمەرگەی بکردایە

سزای بە لەسێدارەدان دەدرا، یان شانسی بۆ پەیدا دەبوو و لە دەست بەعس و چڵکاو خۆرانی قوتار دەبوو، پاشان خۆی دەگەیاندە لای پێشمەرگەکان، وەک کاکە عەبەی خۆمان.

کاکە عەبە بەدەم قرچاندنی رۆن و پیازەوە، باسی خۆشی ژیانی شاری بە جۆرێک بۆدەکردین کە مرۆڤ تامەزرۆی چێشتخانە بەناوبانگەکان و گیپەخانەکانی دەکرد. دیار بوو شارەزاییەکی باشی لەسەر شوێنە باشەکانی نانخواردن هەبوو، هەروەک بە شێوەیەک باسی ئەو جێگایانەی دەکرد کە مرۆڤ هەستی دەکرد کە کاکە عەبە حەزی لە گەڕانەوەیە بۆ ژیانی پێشووی، چونکە لە راستیدا ژیانی سەختی پێشمەرگایەتی بەو نەدەکرا.

هەر ئەمەش وای دەکرد کە هەر بەدەم چێشت لێنانەوە بڵێ:

_ ئەگەر ببێ بە شەڕی ناوخۆ، ئەوا من یەکەم کەسم کە دەڕۆمەوە.

هیچ سیمایەکی شەڕی ناوخۆ لە ئارادا نەبوو، ئەم پێشبینییەی کاکە عەبە هەر خواستێکی نێو دڵی خۆی بوو، چونکە تەنها بەوە دەیتوانی ریزەکانی پێشمەرگە بەجێبهێڵێ و خۆشی بەئاسوودەیی بگەڕێتەوە نێو شار. لەراستیدا هیچ پاساوێک نەبوو بۆ شەڕی ناوخۆ، چونکە بە هەموو لایەنەکانەوە، ژمارەیان لە سی پێشمەرگە تێپەڕی نەدەکرد. ئاگام لێبوو چۆن کاکە عەبە سەروکاری مەنجەڵە برنجە سوورەکەی دەکرد کە لەماڵەکانی نێو دێ خواستبووی. نازانم چۆن دۆشاوی تەماتەی پەیدا کردبوو کە لە دێکانی کوردستاندا زۆر بە دەگمەن بەکار دەهێنرا، بەڵام ئەوە بۆ مرۆڤێکی شیو دۆستی وەک ئەو زەحمەت نەبوو. چاک سەرنجم دەدا بە چ شەوق و زەوقێکەوە سەری مەنجەڵەکەی لادەبردو بە پەنجە نەرمۆڵەکانی چێژی برنجەکەی دەکرد، نەمدەزانی چۆن دەیوێرا دەستبکات بە نێو ئەو مەنجەڵە گەرمەدا.

لای نیوەڕۆ کاک ئەنوەر پەیدا بوو، هەر لە سەرەتای بەیانییەوە چووبووە دەرەوەی دێ و دەورووبەرو ناوچەکەی دەپشکنی و پرسیاری جموجۆڵی سەربازەکانی لە خەڵکی ناوچەکە دەکرد. ئەو هەمیشە کەمینی بەیانیانی بۆ خۆی دادەنا و هەمیشە دەیوت:

_ پێشمەرگە لە سەرەتای ژیانی پارتیزانیدا، زۆر سەختە بۆی بەیانیان بێدار بێت، کاتی دەوێ تا رادەهێنرێت، بۆیە حەزدەکەم جارێ هەرخۆم بەم کارە هەڵبستم.

راستی دەکرد، مرۆڤ لەم کێوە دەتوانێت تا درەنگانێک بە خەبەر بێت، بەڵام کە نووست هێندە شەکەت دەبێت کە بەیانیان زوو ناتوانێت لەخەو هەستێت. خۆشم هەستم بەوەکردبوو و بە کەم و کوڕیم دادەنا. بەڵام کاک ئەنوەر هەردەم دەیوت:

_ هەمووتان رادێن، پەلەتان نەبێت.

مەبەستی کاک ئەنوەر ئەوە بوو، کە ئەوکارە نەکا بە فەرمان، چونکە پێشمەرگایەتی کارێکی ئیختیاری بوو، مرۆڤ خۆی بڕیاری دەدا کە ببێ بە پێشمەرگە، ئەگەرچی ئەو راستییەش دەزانرا، کە ئەوە ئەرکی هەموو هاوڵاتییەکە، یان راستی وایە بڵێم، ئەرکی هەموو لاو و گەنجێکی کوردە کە بەشداری خەبات و تێکۆشان بکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەوکارە زۆرەملێ نەبوو. بڕیار بە دەست خۆی بوو، ئەگەر مرۆڤ لەو حاڵەتانە چاوبپۆشێ کە رژێم زۆرجار خەڵکی ناچار دەکرد کە پەنا بباتە بەر شاخ و ببێ بە پێشمەرگە.

کاک ئەنوەر چاوی بەناوماندا گێڕاو سەیری مەنجەڵی سەر پشکۆکەی دەکرد، سەیری کاک عەبەی نەکرد، بەڵام چاوێکی سەرزەنشتاوی بە نێو هەمووماندا گێڕا کە هەموو بە ئاسانی تێیگەیشتین.

کاتێک نان ئامادە بوو، تەنها کاک ئەنوەر نەیخوارد. نەیویست دڵی کاک عەبەش بشکێنێ و پاساوێکی زۆر موئەدەبانەی هێنایەوە. دەستی کرد بە گیرفانیداو پارچەیەک نانی رەقی شەوی لە گیرفانی دەرهێناو کەوتە کرماندنی. جاروبار قومێک ئاوی نێو مەتارەکەی بەر پشتێنی دەخواردەوە. بە ئەسپایی پێی وتم:

_ کارێکی گرنگترمان، لە چێشت لێنان، لە پێشە.

لە پەیامەکەی گەیشتم بۆیە سەری رەزامەندیم بۆ لەقاند. وابزانم پێشمەرگەکانیش لەو هەڵوێستەی کاک ئەنوەر بە روونی تێگەیشتن، چونکە ئیدی چێشت لێنان دووبارە نەبووەوە.

چەند رۆژێک دوای ئەوە، کاکە عەبە، بێ ئەوەی، شەڕی ناوخۆش روویدات، رێی شاری گرتەبەر و ئیدی نەماندییەوە.

*** 

## ٦

هەواڵەکان دەهاتن، بەتایبەتی بۆ کاک ئەنوەر، کە لەو ناوچەیەدا رۆڵی فەرماندەی عەسکەری دەدی، سەبارەت بە جموجۆڵی سەربازانی رژێم لەو دەوروبەرە.

لە راستیدا لەناو جەرگەی ئەواندا بووین، دەورمان بە سەربازو رەبایا تەنرا بوو، بەڵام ئێمە، چونکە گرووپی بچووک بچووک بووین، بە ئاسانی نەدەبینراین.

ئەوانیش، سەربازانی نێو رەبیەکان، نەدەوێران دابەزنە خوارێ، ئەگەرچی جاروباریش بۆ هەندێ پێویستییان هەر ناچار دەبوون، بە تایبەتی بەرۆژ، کە بێنە نێو دێکان، لەوکاتەشدا، لەسەر داوای دانیشتووان، ئێمە بە هیچ جۆرێک، ئەویش بۆ پاراستنی ژیانی گوندییەکان ، دەستمان، لەوکاتانەدا، لەسەربازانی رژێم نەدەوەشاند.

کاک ئەنوەر دەمەو عەسرێک کۆی کردینەوە، ئەو زانیارییانەی دەستی کەوتبوون، بۆی باسکردین. ئەو وەکو ئەفسەرێکی سەربازی قسەی بۆ دەکردین.

هەواڵە گەیشتووەکان باسیان لەوە دەکرد، کاک ئەنوەر پێی وتین، کە ڕۆژانە دوو زیل سەرباز، بەیانیان لە دووکانیانەوە، دەچن بۆ سەرگەڵو، ئێوارانیش، پێش تاریک بوون، دەگەڕێنەوە. ئەمە نێچیرێکی چەور بوو ، بە تەعبیری کاک ئەنوەر، کە پێویستی دەکرد دەستێکیان لێبوەشێنین هەم وەک چالاکییەک و هەم بۆ ڕژێمیش نیشان بدەین کە ئێمە هەین.

کاک ئەنوەر پیلانەکەی وا بۆ باس کردین:

ـ بە پێی ئەو زانیارییانەی پێم گەیشتوون، ئێواران دوو زیل لەم نزیکانەوە تێدەپەڕن.

هەموو گوێ قوڵاخ بووین. ئێمەش کەم تا زۆر ئەو زانیاریانەمان ، لە لایەن گوندییەکانەوە پێگەیشتبوو، بۆیە ئێمە هەموو وەک شارەزا گوێمان لێدەگرت.

پیلانەکە بریتی بوو لەوەی کە من و کاک ئەنوەر خۆی ، بچینە نزیک جادەی (سیتەک) و سێ پێشمەرگەش، کە هەژارو جوتیارو هاوڕێ بوون لە پشتمانەوە، کە بوو بە تەقە، بمانپارێزن.

شوێنی کەمینەکەمان دوور بوو لە ئاوەدانییەوە، ئەوەش لای کاک ئەنوەر گەلێک گرنگ بوو، کە چالاکییەکەمان نەبێتە مایەی ماڵوێرانی بۆ دێکانی دەوروبەر، چونکە لە هەموو چالاکییەکدا، بە تایبەتی گەر نزیک گوندەکان بوایە، ئەوا ڕژێم، هەر بۆ تۆڵەسەندنەوە، یان چاو ترساندن، دەکەوتە تۆپ بارانکردنی دێکان، بەوەش زیانێکی زۆری لە دانیشتووان، کە زۆربەیان خەڵکانی هەژار و بێ دەرامەت بوون و تەنها بۆ بژێوی ژیانیان دەگەڕان، دەگەیاند.

هەربۆیەش، ئەو شوێنەی کە کاک ئەنوەر هەڵیبژارد، زۆر لە بار بوو، بە تایبەتی کە لەدەمەو ئێوارەدا دەویسترا جێبەجێ بکرێت. ڕۆژ لە کەلەکانی ئەزمڕەوە وردە وردە بەرەو ئاوابوون دەچوو، سێبەر ئەو لاپاڵ شاخانەی ئەزمڕی تەنیبوو، ئاسمان مسرەنگیی دەینواند، درەختەکانیش، بێ جووڵە بوون، وەک ئەوانیش چاوەڕێی ڕووداوێک بن. کاک ئەنوەر نزیک جادەکە خۆی دامەزراند. فەرمانی بە ئێمەش دابوو، بۆیە منیش، لەسەر بڕیاری خۆی، لە لای چەپیەوە خۆم دایە پاڵ گابەردێک و تفەنگەکەم ، کە کلاشینکۆف بوو، سوار و ئامادەی تەقەکردن کردبوو. ئاوڕم لە هەڤاڵان دایەوە ئەوانیش، لە پشتمانەوە، دوور لە ئێمە، هەریەک لە شوێنی دیاریکراو دامەزرابوو.

جادەی نێوان سەرگەڵو و دووکانیان، جادەیەکی سەربازی بوو، بە تایبەتی دوای عەسر، هیچ جۆرە هاتوچۆیەکی تری لەسەر نەبوو، یان ڕاستتر وایە بڵێم ، قەدەغە بوو، بۆیە بۆ ئێمە بەڵگەنەویست بوو کە هەرچی بەو جادەیەدا بهاتایە ئەوا ئیتر دەبوو هاتوچۆی دوژمن بێت، بۆیە کاک ئەنوەر پێی وتین:

ـ هەرچی بەم جادەیەدا هات، دەستی لێ نەپارێزن

بێدەنگ لە پشت گابەردەکەوە چاوەڕوان بووم. سەیری جادەکەم دەکرد کش و مات . ئەوەی لام سەیر بوو دەنگی باڵندەش نەدەبیسترا.

کاتێکی دیاریکراومان لانەبوو، کە بە وردی بزانین زیلەکان کەی دێن. تەنها دەوترا دەمەو ئێواران، ئەمەش بە حسابی گوندییەکان پێش ڕۆژئاوابوونی دەگەیاند، بەڵام وەکو کات، نەماندەزانی بۆیە هەروا، هەموومان، لەچاوەڕوانیدا بووین. هەستم دابووە قەرەوڵی تفەنگەکەم ، وردە وردە جاسووسەکەی لێڵی دەنواند، ترسی ئەوەم لێنیشتبوو گەر تۆزێکی تر تاریک بێت، ئەوا ئیدی، بە زەحمەت ئامانج دەپێکرێت.

تۆزە تۆزە دەورووبەر بولێڵ دەبوو. کاک ئەنوەر هەستابووە سەرپێ، بە دووربینێک سەیری جادەکەی دەکرد. هیچ بەدی نەدەکراو هیچیش نەدەبیسترا. گوێم لە ترپەی دڵم و هەناسەم دەبوو. مەخزەنی کلاشینکۆفەکەم دەرهێنا و سەیری ناواخنیم کرد، پڕ لە فیشەک بوو، مەخزەنەکەم خستەوە شوێنی خۆی. کاک ئەنوەر ئاوڕی لێدامەوە دیاربوو گوێی لەو جووڵەیەم بوو، بە لاچاوی سەیری کردم، هیچی نەوت، شەرمم کردو نەمزانی ئەوکارەم بۆ کرد. دڵنیا نەبووم لە تفەنگەکەم، یان چاوەڕوانی و بێ ئارامی خۆم بوو!

دەنگی هاتنی لۆری لەدوورەوە دەبیسترا، کاک ئەنوەر خۆی دایەوە پاڵ بەردەکەی و ئاوڕی لێدامەوە، سەری بۆ لەقاندم، لەپەیامەکە گەیشتم، دەستم لەسەر پەلەپیتکای تفەنگەکە بوو.

لە دوورەوە دوو لۆری دەرکەوتن، بەڵام لۆری نەبوون، ئاسنی رووت بوو، جادەکەی دەکوتایەوە، تا لێمان نزیک دەبوو ترس و سامی زیاتری پەخش دەکرد. لۆری نەبوو، تانکیش نەبوو، تایەکانی لاستیک و خۆی یەک پارچە ئاسن بوو. تەنها کونێک دەبینرا. من تا ئەوکاتە شتی لەو بابەتەم نەدی بوو ، کە تەواو بەرچاومان روون بوەوە، کاک ئەنوەر هاوری کرد:

_ تەقە نەکەن. ناقیلەیە.

ئەمەی وت، خۆی دانەواندو بە ئیشارەت بە منیشی وت:

_ پاڵ کەوە با نەتبینن و تەقەش نەکەیت.

*** 

## ٧

له راستیدا خەریک بوو ئێمە بکەوینە بۆسەوە. چاک بوو ناقیلەکە لەبەر خێرایی، ئەو، ئێمەی نەدی، دەنا کارەسات دەقەوما. ئێمە چەکێکی وامان پێ نەبوو کە بتوانین بەرەنگاری ئەو (کێوە ئاسنینە) ببینەوە. چەکە سووکەکانی ئێمە کە کلاشینکۆف و سمیرنۆف بوو بە کەڵکی ئەو شەڕە نەدەهات.

دیار بوو کاک ئەنوەر وەکو ئەفسەرێکی دەرچووی کۆلێژی سەربازی عێراقی، ئاشنایی لەگەڵ ئەو جۆرە ئالیاتە هەبوو. ئێمە تا ئەوکاتە هەر تانکمان دیبوو کە نەدەهاتە ناوچەکانی ئێمە بەڵام ناقیلە ئالەتێکی عەسکەری تەواو نوێ بوو بۆ ئێمە.

له گەڕانەوەماندا بۆ بنکەکانمان له (گورگەیەر)، کاک ئەنوەر باسی ناقیلەی بۆ کردین کە چۆن هەموو لایەکی بە پلێت، کە گوللەی ئاسایی نەیدەبڕی، داپۆشراوە ، هەر بۆیەش زوو فەرمانی بە ئێمەدابوو کە بەو چەکە سووکانە تەقەی لێنەکەین، چونکی هیچ سوودێکی نەدەبوو. هەروەک باسی ئەوەشی بۆ کردین کە گەر بمانەوێ جارێکی تر بۆسە لەو شوێنەدا دابنێینەوە، ئەوا پێویست دەبوو کە بە لایەنی کەمەوە، (ئار پی چی)مان لەگەڵ بێت کە ئەوکاتە لامان نەبوو. هەر بۆیەش کاک ئەنوەر زیاتر هانی داین کە جارێ له گوندەکاندا خەریکی

پرۆپاگەندە بین بۆ شۆڕش و بەرزکردنەوەی وورەی دانیشتووان.

کە بە گردەکەی پشتمانەوە سەرکەوتین، دەورووبەرمان تەواو تاریک بووبوو، بۆیە بە زەحمەت ڕێمان دەکرد. هەموو بێدەنگ ، چونکە ڕاهاتبووین، کە تاریک دادەهات لەگەڵ یەکتری قسەمان نەدەکرد.

شەو گەیشتینە دێی عازەبان، وەک عادەتی پێشمەرگە بە سەر ماڵەکاندا دابەشبووین.

زۆربەی ماڵەکان هەژار بوون، لەم ناوچەیە (ئاغا) ی لێنەبوو، تەنانەت جوتیاری دەوڵەمەندیشی لێ نەبوو، بۆیە پاش نانخواردن سەرو بەتانیمان هەڵگرت و چووینە نێو مزگەوتی دێ.

مزگەوتەکان بۆ ئێمە بە تایبەتی بە شەو، ببوونە جێی حەوانەوەمان و تا ڕۆژ دەبووەوە لێی دەماینەوە.

ئەو شەوەش کاک ئەنوەر خشتەی پاسەوانی پێداین. سەرەی پاسەوانی من دەکەوتە دوای نیوەشەو، ئەوەش بە تەواوی ئیستراحەتی لێ تێکدەدام، چونکە نەتدەتوانی بە تەواوی بنووی، باشترین کاتی پاسەوانی ئەوانەی سەرەتای شەو بوون کە دوای ئەوە دەتوانی بە ئاسوودەیی بنووی، یان بەرەبەیانی زوو ، پێش ڕۆژ بوونەوە کە زۆربەی کات ئەنوەر خۆی ئەوکاتە ئێشکی دەگرت. هۆکەشی بۆ ئەوە دەگەڕاندەوە کە سوپا زیاتر لە بەرەبەیانەدا هێرش دەکاتە سەر پێشمەرگە. ئەو شەوە لە مزگەوتەکە لێی نووستین.

نەمدەزانی چەندە نووستووم کە هەستم کرد کەسێک بە ئەسپایی دەمجووڵێنێ و بانگم دەکات، کە چاوم هەڵبڕی وامدەزانی خەوە. لە ڕاستیدا ڕاچەڵەکیم، چونکە ئەوەی دەیجووڵاندم نەمدەناسییەوە، ئەویش بە هۆی ئەوەی هەموو روخساری بە جامانە پێچابوو.

کە باشتر سەرنجم دا، جوتیار بوو، لە سەرماندا جامانەکەی لە سەر و

پۆتەڵاکییەوە ئاڵاندبوو. چرپاندی بە گوێچکەمدا و وتی:

_ هەستە سەرەی پاسـ ـانیتە .

یەکێک لەو شتانەی کە لە شاردا بووم، بە هیچ شێوەیەک پێشبینیم نەدەکرد، ئەم مەسەلەی پاسەوانییە بوو. بیرم لە هەموو شتێک کردبووەوە ئەم پاسەوانییە نەبێ کە لە شیرینی خەودا یەخەت دەگرێ. بە هەرحاڵ خۆم توند کردەوەو تفەنگەکەم کە لە ژێر سەرمدا دامنابوو، کردمە شانم و بەرەو دەرگای مزگەوتەکە ملم نا .

دەورووبەر هێند تاریک بوو کە هیچ شتێک نەدەبینرا، هەموو دونیا نوقمی تاریکی بوو کە تا رادەیەک مەحاڵ بوو بتوانی هیچ ببینی، تەنیا مەگەر جوولە، یان دەنگەدەنگێک بیتوانیبایە هەستت بە لای خۆیدا بجووڵێنێ، دەنا بەو شەوە تاریکە هیچ نەدەبینرا. لای خۆمەوە لە دڵی خۆمدا دەموت: «جا سوودی ئەم پاسەوانییە چییە گەر نەتوانی هیچ بەدی بکەیت».

لەگەڵ ئەوەشدا ئەم پاسەوانییە هەر پێویست بوو بۆ ئەوەی پێشمەرگەکان بە دڵنیاییەوە بتوانن بنوون.

پاسەوانیی دوو کاتژمێر بوو، بەڵام ئەو دوو کاتژمێرە دەبوو بەساڵێک، هەر نەدەبڕایەوە، بۆیە منیش لە پاڵ دیواری مزگەوتەکەدا هەر سەرنجی تاریکیم دەدا. جاروبارێش سەدای خشۆکێک لە نێو درەختەکانی نێو دێوە دەهاتە بەر گوێ و ئەویش هەر زوو لە نێو تاریکیدا ون دەبوو.

بیرم هەر لای زیندانی «هەیئە» بوو، دەبێ ئەو زیندانیانە ئێستا لە چ بارودۆخێکدا بن و چاوەڕێی چ داهاتوویەکی نادیار بکەن و ئەو دڕندانە چۆن هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکەن!. دەبێ وەزعی (غازی ئاوچی) کە زیندانییەکی تورکمان بوو لەگەڵمان و بە سەهو گیرابوو، دەبێ ئەو چۆن بێت ؟! هەرچەند بەرپرسانی زیندان گەیشتبوونە ئەو راستییەی کە غازی مرۆڤێکی بێتاوانە، بەڵام بۆ ئەو دڕندانە، ئەمە مەسەلەیەکی

گرنگ نەبوو، چونکە هەرچی ڕێی بکەوتایەتە ئەو دۆزەخە، قوتاربوونی هەروا سووک و ئاسان نەبوو.

پێڵووەکانی چاوم قورس بووبوون، خەریک بوو خەو دایدەگرتم، بۆیە کەوتمە پیاسە بە دەوری مزگەوتەکەدا. لە ڕاستیدا لە کاتی پاسەوانیدا باش نییە جووڵە، چونکە دەبێ تۆ لە جێگایەکدا بیت کە هەستت پێنەکرێ، بەڵام من بۆ زڕاندنی ئەو خەوە زۆرەی تینی بۆ هێنابووم ناچار بووم بکەومە جووڵە، نەدەبا خەو زەفەرم پێ ببات و زاڵ بێت بە سەرمدا.

دێکانی کوردستان بە شەو لە تاریکیدا دەژین، هیچ ترووسکاییەکی ڕووناکی بە دی ناکرێ، چونکە هەر کە شەو دادێ ئیتر هەموو چراکان و قوتیلە نەوتەکان خامۆش دەکرێن . تەنیا ڕووناکیش بەو شەوانە گەر مانگ نەبێ ئەوا ئەستێرەکانن کە هێند ڕووناکی نابەخشن تا بتوانی بەرپێی خۆت ببینی.

لایتێکی بچووکم لە گیرفاندا بوو، دەرمهێنا و سەیری سەعاتەکەی مەچەکم کرد، هێشتا زۆری مابوو بۆیە لە شوێنی خۆم دانیشتم و سەیری بەرامبەری خۆم دەکرد. نەمدەزانی چەندە وا دانیشتووم کە هەستم کرد وردە وردە تاریکییەکە کاڵتر دەبێ و بەرەبەرە بەر پێی خۆم و تۆزە تۆزە بەرامبەرم دەدی، کەچی خەو هەر تینی بۆ دەهێنام . دەستێک درا لە سەر شانم، کاک ئەنوەر بوو، بە ئەسپایی وتی:

ـ هەستە برۆ تۆزێک بنوو.



## ٨

بەیانی وەک پیشەی هەمیشەیی، بە سەرماڵەکاندا، دابەشبووین. ئەمە نەریتێک بوو کە خەڵکی گوندەکانی کوردستان پابەندی بوون. نەبوونی بارەگایەکی دیار، پێشمەرگەی ناچار دەکرد کە بەو شێوەیە ژیان ببەنە سەر. لەو ماڵانەش هەردەم بە رووخۆشییەوە پێشوازی دەکراین و لەگەڵیاندا هەرچی خۆیان بیانخواردایە ئێمەش لەگەڵیان بەشدار دەبووین. زۆربەی کات هەر نان و ماست بوو، جارجارەش لە هەندێک ماڵ تووشی برێک هێلکە دەبووین کە بە ژەمێکی بێ وێنە لە قەڵەم دەدرا، بەتایبەتی کە لە رۆندا سوور بکرابایەوە. گوندەکانی کوردستان بە گشتی، چەوری کەم دەخۆن، بەتایبەتی لە ژەمی بەیانیاندا بۆیە بە دەگمەن رێکدەکەوت لە ماڵێکدا نان و کەرەیەک بخۆین. راهاتن لە سەر جۆری ژیانی پێشمەرگایەتی ئاسان نەبوو، کاتی دەویست تا مرۆڤ لەگەڵ ئەو ژیانە سەختە خۆی رابهێنێ. دەبوو هەر بەو پۆشاکەی کە بە رۆژ دەتپۆشی هەر بەوانیشەوە شەو بنووی و جل گۆڕین کاری نەکردە بوو، کە زۆرجار بە مانگ یان زیاتر هەر ئەو جلانەی ژێرەوەت دەپۆشی، چونکە کەمجار مۆڵەت دەرەخسا کە لە شوێنێکدا ئەو جلانە بشۆی، لەگەڵ ئەوەشدا مرۆڤ هەر زوو رادەهات و ئەوە نەدەبووە گرفتێکی گەورە. مەسەلەی خۆ شوشتنیش هەروابوو، چونکە لە گوندەکانی کوردستان گەرماو نەبوو، بۆیە هەرجارێک لە

نزیک رووبارێکەوە بۆمان بڕەخسایە، ئەوا دەستوبرد خۆمان لە ئاو هەڵدەکێشا و جل و بەرگمان دەشت، ئەویش زیاتر لە وەرزی هاویندا، چونکە ئەوە، لە زستاندا بە هیچ جۆرێک لەبەر ساردی کەشوهەوا بۆمان نەدەڕەخسا.

ئەو بەیانییە لەوماڵەی بۆمان دەستنیشان کرابوو لەگەڵ دوو هاوەڵی تری پێشمەرگەدا، نان و چامان خوارد. بەراستی مرۆڤ هەستی بە هەژاری و نەداری خەڵکی ئەو گوندانە دەکرد. خانووەکان هەمووی لە قوڕ دروستکرابوون، هیچ سیمایەکی شارستانی پێوە دیار نەبوو، لە هیچ ماڵێکدا نە گەرماو و نە توالێت هەبوو، پیاوان بۆ ئەو مەبەستە پەنایان دەبردە بەر مزگەوت و ژنانیش بۆ کانیی ژنان. لە راستیدا سەرم سووڕدەما کە بۆچی لە هیچ ماڵێکدا ئاودەست نەبوو، بەڵام لەمەودوا تێگەیشتم کە هۆکارەکەی نەبوونی ئاو بوو، هەر ئەو ئاوە بوو کە لە کانی دێوە بە تەنەکە بۆ نێو ماڵ دەهێنرا، بۆیە لە هیچ ماڵێکدا ئاودەست نەدەبینرا، ئەمە سەرەڕای نەبوونی ئاوەڕۆ لە هیچ شوێنێکدا.

دیار بوو، خەڵکی ئەو گوندانە، بەوجۆرە ژیانە راهاتبوون و بۆ ئەوان گرفتێکی گەورە نەبوو، بەڵام بۆ ئێمە کە لە شارەوە هاتبووین، کارێکی ئاسان نەبوو.

رژێمە یەک لەدوای یەکەکانی عێراق، هیچ دەستێکی ئاوەدانی بۆ ئەو گوندانە رانەکێشابوو، هەروەک هەزاران ساڵی لەوەوپێش ژیان بەو سادەیی و دواکەوتووییەی خۆی بەردەوام دەبوو. نە کارەبا نە جادەی قیرتاو ، نە خەستەخانەو نە هیچ شتێک جگە لە مزگەوت کە خەڵکی دێکان بە هەرەوزی دروستیان دەکرد، بۆ ئەو گوندانە کرابوو، تەنها شتێک کە لە زۆربەی گوندەکاندا دەبینرا قوتابخانەیەکی لە قوڕ دروستکراو بوو کە هیچی لە خانووەکانی تر جیاواز نەبوو، هەرچەندە ئەوە بۆ خۆی لای دانیشتووان، زۆر مایەی شانازی بوو، چونکە دەیانووت، هەر نەبێ منداڵەکانمان فێری خوێندەواری دەکەن.

ڕادەی نەخوێندەواری لە گوندەکان گەلێک زۆربوو، بە دەگمەن لە نەوەی پێشوو کەسێکی خوێندەوارت دەدی کە ئەویش لە باشترین حاڵدا لە قوتابخانەیەکی ئایینی کە پێی دەوترا حوجرە فێری هەندێ خوێندنی سەرەتایی دەبوو. لە نێو ژناندا هەرگیز خوێندەوارێکت بەرچاو نەدەکەوت و سەد لەسەدی هەموو ژنانی دێ نەخوێندەوار بوون. جاروبار لە هەندێ ماڵ رادیۆیەکی ترانسیستۆر بەرچاو دەکەوت کە لە زۆربەی کاتدا بێ پیل و تەنها دیکۆر بوو، مەسەلەی بوونی کتێب لە ماڵەکاندا، جگە لە قورعان لە هەندێ ماڵدا، ئەویش بە هیچ جۆرێک بەرچاو نەدەکەوت، گەر بە دەگمەن ڕێکبکەوتایە و شتێکی لەو بابەتە بەدی بکرایە ئەوا لە چەند لاپەڕەیەکی شڕ و دڕاو زیاتر کە زۆربەیان شیعری کۆن بوون، زیاتر نەبوو.

هەموو لە ناوەڕاستی دێ لە دەوری کاک ئەنوەر کۆ بووینەوە، ئیدی رۆژێکی نوێ بوو، دەبوو پلان دابنێین کە چی بکرێ، هەرچەندە، لە زۆربەی کاتدا، لە جەولە زیاتر نەبوو، جەولەش ئەو جەولەیە بوو کە پێشمەرگە ڕۆژانە بە نێو دێکاندا دەگەڕاو خۆمان بە چەکەوە نیشانی خەڵکی دەدا کە شۆڕش و مقاوەمەت دەستی پێکردۆتەوەو هەندێ جاریش خەڵکی گوندەکانمان کۆ دەکردەوەو بڕێ باسی شۆڕش و زوڵم و زۆرو ناهەقی دەسەڵاتمان لە بەغدا دەرهەق گەلی کورد بۆ دەکردن کە لە زۆربەی کاتدا تەنها سەریان بۆ دەلەقاندین و کەمجاریش ڕێکدەکەوت کە کەسیان پرسیارێ بکات. لە راستیدا ئەو «موحازەرانە» هەمیشە دووپات دەبوونەوە، چونکە نە ئێمە ئاستی وشیاری سیاسیمان بەو رادەیە بوو ، ئەگەرچی هەموومان خوێندەواریش بووین و لە شار هەر یەکەمان شتێکی خوێندنبوو، لەگەڵ ئەوەشدا کەسمان شارەزاییەکی ئەوتۆمان لە خوتبەدان و وتارخوێندنەوە نەبوو. هەموو قسەی گشتی بوون تەنانەت لای ئەو کەسانەی کە خۆیان بە رابەر سیاسیش دادەنا، ئەوندەی لەگەڵ قسەکانی ئێمەدا جیاوازی نەبوو.

هەموو خۆمان تا رادەیەک بە چەپ دەزانی، بەڵام کەسمان بەو رادەیە

له چەپێتی نەگەیشتبووین هەر ئەوەندەمان دەزانی کە دەبێ دژی ئاغا و دەرەبەگ بین کە لەم ناوچانەی جەولەمان تێدا دەکرد، نە ئاغای لێ بوو نە دەرەبەگ، بۆیە ئەو تۆزە زانیارییەی هەشمان بوو هێندە کەڵکی نەبوو، بەڵام ئێمە هەر بەردەوام بووین و بە ئەرکی رۆژانەی سەرشانی خۆمان دەزانی و لەو رێگەیەوە دەمانویست جوتیاران و دانیشتووانی ئەو ناوچانە هوشیار بکەینەوە، ئیدی ئەوان خۆیان چەند لێمان تێدەگەیشتن، ئەوە کێشەی ئێمە نەبوو.

کاک ئەنوەر فەرمانی پێداین کە بەرەو دێی چنگیان بکەوینە رێ و سەرەتای جەولەی نوێمان بەرەو ئەوێ بچین.

گوندی (چنگیان) بۆ ئێمە زۆر خۆشبوو، چونکە ژمارەی خانووەکانی زیاتر و دێیەکەش لەچاو دێکانی ناوچەکەدا گەورەتر بوو. ئەوەی مایەی دڵخۆشی بوو بۆمان ئەوە بوو، کە لەو دێیەدا چەند دوکانێک هەبوون کە نوقڵ و بنێشت و هەندێ کەلوپەلی سەرەتایی تێدابوو، بۆیە بە شەوقەوە بەرەو ئەو دێیە ملمان نا.

جوتیار بە تەنیشتمەوە دەرۆیشت و زۆر خۆشحاڵ دیار بوو کە لە هۆی ئەو زەوق و خۆشییەی بە روخسارییەوە دەردەکەوت لێم پرسی ، خێرە وا دەتریقێیتەوە؟

لە وەڵامدا وتی:

ـ بە تەمام هەندێ بسکیت و ئاوێنەیەکی بچکۆلەو جوتێ گۆرەوی بکرم.

جوتیار لەو ناوچانە رۆڵی رابەر سیاسی دەگێرا.



## ٩

دەمەو نیوەڕۆ گەیشتینە (چنگیان). ئەم دوو دێیە زۆر دوور نەبوون لەیەکتری و ڕێگاکەش هێندە سەخت نەبوو لە نێوانیاندا.

هەموو خۆشحاڵ بووین بە بینینی ئەو دێیە کە بڕێک جیاوازتر بوو لە دێکانی تر . هەر بە گەیشتنمان بۆ ناو دێ، یەکسەر ملمان نا بۆ ئەو چەند دوکانەی کە بە پەنجەی دەست دەژمێردران، بەڵام بۆ ئێمە گەلێک زۆر بوو. هەریەکەو شتێکی دەکڕی. من هەندێ پارەم لەگەڵ خۆمدا هێنابوو کە تا ئەو کاتە نەمدەزانی چی لێبکەم بۆیە منیش وەک ئەوان ڕووەو دوکانەکان ملم نا. دوکانەکان زۆر سادە بوون و هیچی وا سەرنجڕاکێشی تێدا نەبوو، بەڵام بۆ ئێمەی پێشمەرگە کە نەماندەتوانی بچینە نێوشارۆچکەکان گەلێک زۆر بوو.

من فانیلەیەکی ژێرەوەو جووتێ گۆرەوی و جووتێک پێڵاوی لاستیکم کڕی . ئەوانەی خۆم زۆر رەق و تەق بوون و بە کەڵکی ئەو شاخ و داخە نەدەهاتن.

بەڵام پێڵاوی لاستیک زۆر عەمەلی تر بوو. وابزانم زۆربەی خەڵکانی دەرەوەش، هەر پێڵاوی لاستیکیان بەکاردەهێنا، کە پێویستی بە هیچ

خزمەتکردنێک ، وەکو بۆیاخ و قەیتان نەبوو، هەروەک بە ئاسانیش دەشۆراو بە زووییش وشک دەبووەوە.

پێڵاوە کۆنەکانم تووڕدا کە هیچ کەڵکی پێوەنەمابوو تا بە کەسێکی دی ببەخشم. نانی نیوەڕۆمان لە ماڵەکانی نێو دێ خواردو پاشنیوەڕۆ کەوتینەوە رێ، یان وەکو خۆمان پێمان دەوت (جەولە) . بە پشتی دێدا سەرکەوتین. هەورازێکی قووچ بوو، بەڵام چارمان نەبوو، بۆیە هەموو بەدوای یەکدا رێچکەمان بەست و بە هەورازدا هەڵزناین ، کە گردەکەمان بڕی دێیەک لە دوورەوە بە دی دەکرا، کە لە هاوەڵی تەنیشتم پرسی وتی:

_ ناوی (باراو) ە.

داگەڕاینە ناو دێ و لە مزگەوتی دێ پشوویەکمان دا. من لەو فرسەتەدا فانیلە و گۆرەوییەکانم گۆڕی. زۆر نەبوو دانیشتبووین کە کاک ئەنوەر فەرمانی داو وتی:

_ کوڕینە ناتوانین شەو لێرە بین و دەبێ بچین بۆ (حاجی مامەند)

ئەو ناوەم نەبیستبوو، هیچ پێویستیشی نەدەکرد کە لە هاوەڵەکانم بپرسم، چونکە خۆمان هەر پێی دەگەیشتین. لەراستیدا حەزم نەدەکرد هێندە لەناوی دێ و دوورو نزیکیان بپرسم، چونکە ئەوە رادەی نەشارەزایی منیان دەدرکاند.

کەوتینەوە رێ، ئەمجارە رێگەکە گەلێ سەختتر بوو، بەڵام هەموو بێدەنگ ملی رێگامان دەگرت و بێ ورتە رێمان دەکرد.

هەموو وردە وردە فێری ئەوە بووین کە لە رێگەدا لەگەڵ یەکدی گەر پێویست نەبێ هیچ نەڵێین و لە باتی ئەوە گوێقوڵاخ و بەئاگای

دەورووبەری خۆمان بین.

من لە دەورووبەرم دەڕوانی، هەمووی شاخ و بەردو ڕەقەنی و هەڵەت و گرد و دۆڵ بوو، تەختایی، جگە لەو تولەڕێیەی پێیدا دەڕۆیشتین، هیچی دی نەبوو.

ئێستا ئیتر هێدی هێدی درکم بەو ڕاستییە دەکرد کە بۆچی دوژمن ناتوانێت کوردستان کۆنترۆل و بەتەواوی داگیر بکات. ئەو هەموو شاخ و کێوە سەختانە بە کێ دەگیرا. ئەمەش هەر ئەو ڕاستییەی دەسەلماند کە دۆستی هەرە دێرینی کورد شاخەکانییەتی و ئەوە کە توانیویەتی لە ڕۆژگاری دووردرێژی مێژوودا بیپارێزێ و دوژمن نەتوانێت، وەکو گەل، لەناوی بەرێت.

ئێمە بەدەوام دەڕۆیشتین و بە هەورازدا سەردەکەوتین و دادەگەڕاین. لێرە ژیان وەک ژیان خۆی هەورازو نشێو بوو. چەند سەختیمان دەکێشا کە بە هەورازدا سەردەکەوتین، هێندەش لە داگەڕاندا ئاسوودە دەبووین.

شتێک کە هەر زوو درکم پێکرد ئەوە بوو کە پێشمەرگە بە دەگمەن لە ڕێگەدا پشووی دەدا، وا بزانم کەس حەزی نەدەکرد، لە ڕۆیشتندا وای پیشان بدات کە شەکەت بووە و پێویستی بە پشووە. هەموو یەک لەدوای یەک دەڕۆیشتین و کەسیش سکاڵای لە هیلاک بوون نەبوو. تەنها کاتێک کە پێشمەرگە، بێ ئەوەی داوا لە بەرپرسەکەی بکات و دابنیشێ ئەوکاتانە بوو کە دەگەیشتینە کانی و ئاوێک و ئیدی بێ پرس و مۆڵەت، هەموو ڕووەو کانی دەچووین و سەرو چاوو دەست و پلمان دەشۆری و تا بمانتوانایە ئاومان دەخواردەوە کە هەندێک جار ئاوخواردنەوەی زۆر، تووشی گرفت و سک ئێشەی دەکردین، بۆیە لەمەودوا فێر بووین کاتێک دەگەیشتینە سەر کانییەک، لە سەرەتادا

برێ بۆی دادەنیشتین و پاشان دەستمان بە ئاوخواردنەوە دەکرد. خۆشبەختانە ئاوی سازگاری کوردستان هێند پاک و روون و بێگەرد بوو کە پێویستی بە هیچ نەدەکرد و دەتوانرا راستەوخۆ بخورێتەوە. گەر هەندێ کاتیش پەلەمان نەبوایە و شوێنەکە ترسی لە سەر نەبوایە ئەوا دەمانتوانی چایەک لە سەر کانی بخۆین کە بۆ ئێمەی پێشمەرگە خۆشییەکی بێ وێنەی پێ دەبەخشین.

هەندێکجار کە هەستم بە شەکەتی خۆم دەکرد، ژیانی شارم دەهاتە پێش چاو، کە چۆن زۆربەی کات بە تەکسی، یان پاسی گەڕەک دەڕۆیشتم، ئەگەرچی شوێنەکان هێندە لێک دووریش نەبوون، بەڵام من هەر بە پێ نەدەڕۆیشتم. لە دڵی خۆمدا سەرزەنشتی خۆم دەکرد و دەموت، گەر ئەوکاتانە تۆزێک بە پێ بڕۆیشتمایە، رەنگ بوو ئێستا، بەو شێوەیە هەستم بە هیلاکی نەکردایە.

ژیانی سەختی لادێکانی کوردستان، هەر بە خەڵکی گوندەکانی تەحەمول دەکرا، بۆ ئێمەی خەڵکی شار، یەکجار سەخت بوو ، لەگەڵ ئەوەشدا وردە وردە رادەهاتین، ئەی چارمان چی بوو؟

سەرم هەڵبڕی و سەیری لای شانی راستی خۆم کرد، شاخێکی یەکجار بەرز دەهاتە پێش چاوم لە سەر لووتکەکەیەوە بە ئاستەم خانوویەک بەدی دەکرا ،پێم سەیر بوو لە سەر ئەو لووتکە بەرزە ژیان بە دی بکرێ، بۆیە بە ئەسپایی لە هاوڕێکەی پشتەوەم پرسی و وتم:

ئەو خانووە چییە بەو بەرزییەوە؟

زۆر بە بێ بایەخییەوە وتی:

ـــ رەبییە یە.

شەرمم کرد ، نەدەبوو پرسیاری ئەو بابەتە بکەم، نازانم خەیاڵم لە کوێ بوو، لە شار ؟ یان چوو بوومە نێو جیهانێکی ترەوە، خانووی چی؟ خانوو لەو بێ ئاوی و رەقەنی و بەرزاییە چۆن دروست دەکرێت. ئەوە هەر دەبوو رەبایای سەربازی بێت و لەبەر سەختی شوێنەکەیش تەنیا بە هەلیکۆپتەر دەتوانرا ئاو و پێویستی ژیان بۆ سەربازەکان ببرێ، بە راستی نەدەبوو ئەو پرسیارە بکەم. هەر بۆ داپۆشینی ئەو بێ ئەزموونییەم ئاورم لە هاورێکەم دایەوەو وتم:

_ تاقیم کردیتەوە!

ئەو وەڵامی نەدایەوە و منیش بێدەنگیم لێکرد، تاقیکردنەوە؟ ئایا توانیم بەم وەڵامەم نەشارەزاییەکەم پەردەپۆش بکەم، بڕوا ناکەم، هەر بۆیە بە بێ ورتە لە سەر رۆیشتنی ئاسایی خۆم بەردەوام بووم.

کە سەرم بڵند کرد، حاجی مامەند لە پاڵ چەند شاخێکدا وەک تابلۆیەکی زەیتی بە دی دەکرا...

***

## ١٠

کاتێک گەیشتینە حاجی مامەند، ڕۆژ بەرەو ئاوابوون دەچوو، ناتوانم بڵێم شەکەت و بێهێز نەبووم ، بەڵام لەڕۆژانی پێشووتر چاکتر بووم. ڕۆژ لەدوای ڕۆژ هەستم دەکرد کە ڕۆیشتن و ڕەوتم بەرەو پێشەوە دەچێ و لە سەر ڕۆیشتنی بەردەوام ڕادەهاتم.

سەگوەڕێکی بەهێز لە نێو دێ پێشوازی لێکردین. من تێبینی ئەوەم کردبوو کە سەگ کاتێک چەک بەشانی دەدیت دەسڵەمییەوەو لە وەڕین و حەپەحەپ دەکەوت. لێرەش هەروا بوو، بۆیە بە زوویی لێمان دوورکەوتنەوە. لە مزگەوتی حاجی مامەند سەروچاومان شت و پشوویەکمان دا.

کە تاریک داهات بە سەرماڵەکاندا دابەش بووین، کاک ئەنوەر ئاگاداری کوێخای دێی کرد کە دوای نانخواردنی ئێوارە حەزدەکات پیاوانی دێ لە مزگەوتدا کۆ ببنەوەو باسی شۆڕشی نوێ یان بۆ بکات. ئەوە بوو، بە نەریتێک، لە زۆربەی دێکاندا پەیڕەو دەکرا، هەم بۆ ناساندنی شۆڕشی نوێ و ئامانجەکانمان و هەم بۆ ئاشنابوونی پێشمەرگەکان بە دانیشتووانی دێکان.

دوای نانخواردن زۆربەی هەرە زۆری دانیشتووانی دێ لە مزگەوت کۆبوونەوەو کاک ئەنوەر وەکو سەرەتایەک هەندێ باسی شۆڕشی بۆ خەڵک کردو پاشان مۆڵەتی دا بە رابەری سیاسی مەفرەزەکەمان کە ئەویش قسەی خۆی بکات. لە راستیدا وتەکان زۆربەی سەبارەت بە رژێمی بەعس و حکوومەتی عێراق بوو کە هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدایە، بە هەموو شێوەیەک، گەلەکەمان لەناو بەرێت.

بابەتی قسەکان لەزۆربەی دێکاندا کە بۆ دانیشتووان دەکرا دووپات دەبوونەوە، بۆیە بۆ ئێمەی پێشمەرگە هیچی وای نوێی تێدا نەدەبوو کە لەوەوپێش نەمانبیستبێت، لەگەڵ ئەوەشدا، ئێمەش وەکو خەڵکی دێ زۆر بە بایەخەوە گوێڕایەڵی وتەکانی رابەر سیاسی دەبووین وەک ئەوەی بۆ ئێمەش بابەتێکی نوێ بێت. ئەوەی باش بوو وتارەکان زۆری نەدەخایاند و پاشان سەرە دەهاتە سەر پرسیاری دانیشتووان کە هەندێجار دەیانکرد، چونکە زۆربەی گوێگران هەر بە گوێ گرتن و بێ دەنگی هەستیان دەدایە وتاربێژ. گەر جارێکیش پرسیار بکرابایە، ئەوا زیاتر باسی ئەوە دەکرا کە نیازی داهاتووی رژێم بەرانبەر دانیشتووانی دێکانی کوردستان چی دەبێ، چونکە هەمیشە دەنگۆی ئەوە دەبیسترا کە حکوومەتی عێراق بە نیازە ناوچە سنوورییەکان، لە دانیشتووان چۆڵ بکات و بەرەو ناوەوەی وڵات راپێچیان بکات.

زۆرجاریش، دانیشتووانی دێکان، نیگەرانی خۆیان نەدەشاردەوە لە هاتوچۆی پێشمەرگە، بەتایبەتی بەرۆژی رووناک و دەیانوت، گەر سەربازگەو رەبییەکان بەوە بزانن، ئەوا سزای توندی دانیشتووان دەدەن، بۆیە ئێمەش دڵنیامان دەکردنەوە کە تا بتوانین بەرۆژ خۆمان دەرناخەین و بەشەو هاتوچۆ دەکەین، هەرچەند، هەندێک جار، هەر ناچار دەبووین کە بە رۆژیش خۆمان ئاشکرا بکەین، لەگەڵ ئەوەشدا نیگەرانی خەڵکانی دێمان رەچاو دەکرد و تا بمانتوانیبایە بەرۆژ

نەدەچووینە ئەو دێیانەی نزیک ڕەبایا و سەربازگەکان بوون.

کاتێک خەڵکی نێو دێ بە جێیانهێشتین ، کاک ئەنوەر پاسەوانیی شەوی بۆ دیاری کردین و هاتە نزیکمەوەو بە ئەسپایی پێی وتم:

_ ئەمشەو سەرەی پاسەوانیم زوو بۆ داناویت بۆ ئەوەی پاشان بتوانی بنووی، چونکە دەزانم دوێنێ شەو باش نەنووستوویت.

لە دڵەوە سوپاسم کرد، چونکە دوای ئەو ڕۆیشتنە دووروودرێژە، پێویستیم بە پشوودانێکی ڕاستەقینە بوو. هەرزوو لێی پاڵکەوتم، بەڵام هەرچەندم دەکرد خەوم نەدەهات ، بە پێچەوانەی دوێنێ شەو کە تینووی سەرخەوێک بووم.

لەشاردا وا ڕاهاتبووم کە شەوانە درەنگ بنووم، بۆیە بۆ من ئاسان نەبوو وا بە زوویی بچمە نێو جێگە. دەبوو ئیتر خۆم ڕابهێنم، چونکە کاتی خەوتنمان دیار نەبوو، یان کاتێکی دیاریکراو بۆ خەو نەبوو. ئەوە پەیوەست بوو بەو شوێنەی بۆی دەچووین،گەر شوێنەکە نزیک جادەو سەربازگەو ڕەبایا بوایە، ئەوا هەر کات، نیوەشەویش بوایە، هەردەبوو بڕۆین تا شوێنێکی گونجاومان بۆ حەوانەوە دەست دەکەوت کە مەترسی لە سەر نەبوایە. لە ڕاستیدا ئێمە دەبوو، لەو سەرەتایەدا، خۆمان لە هێزەکانی ڕژێم بپارێزین و خۆمان تووشی شەڕێکی نابەرانبەر نەکەین.

من هەر ئەمدیوو ئەودیوم دەکرد و نەمدەتوانی بنووم کە هاوەڵەکەی تەنیشتم بە ئەسپایی وتی:

_ دەڵێی خەوت لێناکەوێت.

چرای دیواری مزگەوتەکە تەواو کز کرابوو، بۆیە بە ئاستەم هاوەڵەکەم

دەدی. من سەرم بۆ لەقاند. نازانم لەو جووڵەیە گەیشت یان نا کە ئەو وتی:

_ حەزدەکەی گوێ لە گۆرانییەک بگری؟

گۆرانی؟! وەمزانی ڕادەبوێرێ بەو شەوە، بەڵام ئەو لە توورەکەکەی ژێر سەریدا رادیۆیەکی ترانسستەری بچکۆلەی دەرهێنا و وتی:

_ فەرموو

بڕوام نەکرد، بەڵام راستی دەکرد بۆیە بە پەلە میلی رادیۆکەم بە ئەسپایی بزواند. ئێستگەی مونتی کارلۆ بوو. دەنگی بە سۆزو دڵهەژێنی نەجات سەغیرەی لە سەر بوو، تا کاتی پاسەوانیم خۆم پێوە مەشغوڵ کرد.

***

## ١١

بەیانی کە هەستاین، ئەنوەر هەموومانی گردکردەوەو وتی: دەبێ بە زووترین کات ئەم ناوچەیە بە جێ بهێڵین. لە پرسیاری ئەوەی ئایا هیچ پێشهاتێکی نوێ هاتۆتە کایەوە وتی:

_ ئەمشەو سەردانی ماڵی کوێخای دێم کرد و هەندێ زانیاری وردی پێدام، پێویست دەکات لەم دەڤەرە نەمێنین.

ئێمەش زیاتر لە سەری نەڕۆیشتین و هەریەکەو لە ماڵێک پاروویەک نانمانخوارد و ئیدی ئامادە بووین. من مەراقم بوو بزانم هۆکاری ئەو پەلەپەلییە لەچیدایە، بۆیە هەر کە کەوتینە ڕێ چوومە لای ئەنوەرو پێم وت:

_ تۆزێ بەوردتر هۆکاری ئەم جووڵە ناکاوەم بۆ باس ناکەیت؟

سەیرێکی قووڵی کردم و وتی:

_ زانیارییەکان دەڵێن، سوپا بەنیازە هێرشێکی بەربڵاو بکاتە سەر ناوچەی شارباژێڕ. بۆیە دەبێ ئێمەش، بە زووترین کات، لەم ناوچەیە بڕۆین و خۆمان بگەیێنینە ئەو بەر.

لەبەر نەشارەزاییم لە جوگرافیای ناوچەکە وتم:

_ مەبەست لە ئەوبەر کوێیە؟

هەر بەدەم ڕۆیشتنەوە وتی:

_ مەبەست دۆڵی جافایەتییە.

من هێشتا وەک پێشمەرگە، دۆڵی جافایەتیم نەدیبوو، بەڵام هیچ پرسیاری ترم نەکرد، چونکە ئێمە بەرەو ئەوێ دەچووین و خۆمان بەڕۆیشتن هەموو ناوچەکانمان دەدیت. گرنگ ئەوە بوو ئێمە تووشی سەربازەکان و ئابلۆقەیان نەبین، چونکە وەک ئەنوەر باسی کرد، جارێکی تریش تووشی هێرشی سەربازی بوون لەو ناوچەیەداو زۆر بە زەحمەت رزگاریان بووبوو. من دەمویست بزانم ، کاتێک ئێمە شوێنی دیاری کراومان نییە، چۆن هێرش دەکرێتە سەرمان. ئێمە هەمیشە لە جووڵەدابووین و بارەگایەکی نەگۆڕمان نەبوو، بۆیە ئەوەم وەک پرسیار لە ئەنوەر کرد.

لە وەڵامدا وتی:

_ راستە ئێمە تا ئێستا، بارەگامان نییە، بەڵام ئەوە لای ئەوان گرنگ نییە. ئەوان بە گشتی سەیری ناوچەکە دەکەن و زانیارییان هەیە کە ئێمە لەم دەڤەرەین، ئیدی ئەوان لە هەموو لایەکەوە هێرش دێنن و ئابلۆقەی تێکڕای ناوچەکە دەدەن و پاشان وردەوردە ئابلۆقەکە تەسک دەکەنەوە تا ئەو ئاستەی کە مۆڵەتی دەربازبوون ناهێڵن. هەرچەند تا ئێستا ئەوان لە بەر سەختی ناوچەکە و شاخ و کێو و دۆڵی لەبن نەهاتوو، نەیانتوانیوە سەرکەوتووبن، بەڵام توانیویانە پێشمەرگە لەو ناوچانە دوور بخەنەوەو ناچارمان بکەن ئەو ناوچانە بە جێبهێڵن.

پاش تۆزێک بەردەوام بوو:

_ بەڵام هەرکە ئۆپراسیۆنەکانیان تەواو دەبوو، ئێمەش دەگەڕاینەوە بۆ ناوچەکەمان و ئەوانیش بە دەستی بەتاڵ دەگەڕانەوە، هەرچەندە

لەو هێرشانەیاندا تا بیانتوانیبا ئەزیەتی دانیشتووانی گوندەکانیان دەداو داوای شوێنی بوونی پێشمەرگەیان لێدەکردن، بەڵام بە حوکمی ئەوەی ئێمە هەمیشە لە جووڵەدابووین، نەیاندەتوانی هیچ زانیارییەکی بەسوودیان بدەنێ.

لە راستیدا، دەبوو ئێمە، هەمیشە، خۆمان لە سەربازو سەربازگەکان بپارێزین، چونکە ئەو چەکەی کە ئێمە پێمان بوو لە کلاشینکۆف زیاتر نەبوو کە بەراورد نەدەکرا لەگەڵ چەک و جبەخانەی رژێمدا. هەوڵی ئێمە زیاتر بۆ ئەوە بوو کە بە دانیشتووانی گوندەکان بسەلمێنین کە بەرەنگاری دەستی پێکردۆتەوەو گەل خەباتی چەکداری نوێ کردۆتەوە. ئەمە بۆ ئێمە گرنگ بوو، چونکە کە دانیشتووان ئێمەیان بە چەکەوە دەدیت گەشکە دەیگرتن و خۆشحاڵی خۆیان نیشان دەدا و لە ئامێزیان دەگرتین. ئێمە دەمانویست بیسەلمێنین کە پێشمەرگەین، هەرگیز کۆڵ نادەین.

لە پرسیاری ئەوەی کە بەچەندی تر دەگەینە دۆڵی جافایەتی؟ ئەنوەر وتی:

_ رەنگە ئەمڕۆ نەگەین ، بەڵام هیواداریین خۆمان بگەیێنینە سەرجادەی چوارتا، بۆ ئەوەی بتوانین بەشەو لەوێوە تێپەڕین. هەر بەو رێگایە کە پێیدا هاتبووین بۆ حاجی مامەند رێمان دەکرد، بەڵام ئەمجارەیان خێراتر رەوتمان دەکرد.

تامەزرۆ بووم بزانم کە ئایا بەم زووانە ئەو هێرشە دەکرێتە سەرمان ؟

لەوەڵامدا وتی:

_ رۆژەکەی نازانرێ، ئەوە نهێنی خۆیانە، بەڵام خۆ ئامادە کردنیان هەست پێدەکرێت، بۆیە دەبێ ئێمەش مۆڵەتیان بۆ نەڕەخسێنین کە ئابلۆقە بدرێین.

دەمەو نیوەڕۆ لە دێی باراو لامان داو نانێکی سەرپێیمان خوارد و لەسەر ڕۆیشتن بەردەوام بووین. گرنگ ئەوە بوو تا ئێوارە، ئێمە، بگەینە شوێنی پەڕینە،..

دەمەو عەسر گەیشتینە (چنگیان) بەڵام لامان نەدا، نەماندەویست کات بە فیرۆ بدەین، پێویست بوو هەر چۆنێک بێت، پێش تاریکبوون، بگەینە شوێنی مەبەست، هەر لەبەر ئەوە لە هیچ جێگەیەک لامان نەدەدا. ئێوارە گەیشتینە دێی (گەڕە دێ) ئەمە دوا جێگەمان بوو تا کاتی پەڕینەوە. لێرە ئیدی دەبوو زۆر بەئاگا بین و بە هۆشیارییەوە هەڵسوکەوت بکەین.

پەڕینەوە لەجادەی چوارتا گەلێک ترسناک بوو، چونکە هەمیشە کاروانی سەربازی تێیدا هاتووچۆی بوو. ئۆتۆمبێلی سەربازی هەمیشە دەبینرا کە لە شاخی ئەزمڕەوە بەرەو چوارتا دەچوو. ئەم ناوچەیە ناوچەیەکی سەربازی بوو، ڕەبایاو سەربازگە و سەیتەرە، لە هەموو شوێنێکی، دەبینرا. کە تاریک داهات ئەنوەر دەلیلێکی پەیدا کردبوو کە لە پێشمانەوە دەڕۆیشت. گرنگ ئەوە بوو، لە کاتی خۆیدا، بگەینە سەر جادەی قیرو لە کاتی گونجاودا بپەڕینەوە. ئێمە لە پشت دەلیلەکە کە نزیک جادەکە وەستابوو، بە دەست ئیشارەتی بۆ دەکردین. هەر کە مۆڵەت دەبوو دوو دوو دەپەڕینەوە.

بینینی گڵۆپ و جادەی قیرتاو نیشانەی ئاوەدانی بوو کە ئێمە لێی بێبەری بووین.

دوا کەس ئەنوەر خۆی بوو کە لە جادەکە پەڕییەوە.

***

## ١٢

خۆشبەختانە، هیچ پێشهاتێکی نەخوازراو نەهاتە پێشمان و هەموو بە سەلامەتی لە جادەکە پەڕینەوە. لە ڕاستیدا پەڕینەوە لەوجۆرە جادانە، کارێکی مەترسیدار بوو ، چونکە لە هەموو ساتێکدا ئەگەری ئەوە هەبوو دووچاری مەفرەزەیەکی سەربازی یان جاش ببینەوە و تووشی شەڕ بین لەگەڵیان. هەرچەندە ئێمە هەمیشە ئەوەمان خستبووە بەرچاوی خۆمان کە بکەوینە شەڕەوە لەگەڵیان، بەڵام لە سەرجادەی قیر و لەنێوان دوو سەربازگەی گەورەدا کە سەربازەکان بە ئاسانی دەیانتوانی بە هانای یەکدییەوە بێن، بۆ ئێمە کارێکی سەرکەوتوو نەدەبوو. بۆیە دەبوو ئێمە خۆمان بڕیار بدەین لە کوێ و لە چ کاتێکدا لە دوژمن دەدەین.

هەربۆیەش کە پەڕینەوە بۆ ئەوبەر جادەکە، چووینە نێو دێی (تەگەران)، و هێندە نەماینەوە.

ئەنوەر کە شارەزای ناوچەکە بوو داوای لێکردین کە بە زووترین کات ئەو نزیک جادەیە بەجێبهێڵین و بکەوینە ڕێ بەرەو گوندی (خەمزە).

گوندی (خەمزە) دەکەوتە ئەمدیو شاخی گوێژەوە، شوێنێکی تا

رادەیەک عاسی و باشبوو بۆ حەوانەوەی پێشمەرگە، ئەگەرچی لەراستیدا ئەوەندەش دوور نەبوو لە سەیتەرەکەی ئەزمڕەوە، بەڵام شوێنەکەی نادیار بوو ، بۆیە دەتوانرا بۆ پشوودان سوودی لێوەربگیرێ.

ڕۆیشتنی شەو هەمیشە سەختترە لە رەوتی رۆژ، بۆیە بەو تاریکییە کارمان ئاسان نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا، بۆ دوورکەوتنەوە، ناچار بووین، هەر مل بنێین.

لە دوورەوە چراکانی خەمزە دەردەکەوتن ، بۆیە مایەی دڵخۆشی بوو بۆمان.

بەڵام هەر دەڕۆیشتین و نەدەگەیشتین. نازانم هی تاریکی شەوەکە بوو، یان ئەو هەورازو هەڵەت و سەرکەوتنە بوو کە رێگەکەی لێمان وا سەخت کردبوو. بە بێدەنگی رێچکەمان بەستبوو، جاروبار سەرم هەڵدەبڕی، دووری دێ ، هەروەک خۆی بوو، لەوە نەدەچوو هیچ بەرەوپێشەوە چووبین، من وا هەستم دەکرد، یان بەراستی لە جێی خۆمان دەخولاینەوە، هەر کامیان بێت، لای من دوورییەکە هەر وەک خۆی بوو.

سەراپای رۆژەکە بەرێوەبووین و بەم تاریکەشەوەش هەر بەردەوام بووین ، بۆیە هەستم بە شەکەتی جەستەو قورسیی هەنگاوەکانم دەکرد.

خاڵە نەبەز کە لە دێی (گەرە دێ)وە دەگەڵمان کەوتبوو، زۆر باش هەورازی دەبڕی و هیلاکی هیچ پێوە دیار نەبوو. ئەو پێشمەرگەیەکی قاڵبووی خەبات و تێکۆشان بوو، بەشداری شۆڕشی ئەیلوولی کردبوو ، لە شەرێکی زۆر سەختدا بە فۆسفۆر بریندار بوو بوو کە شوێنەواری بە جەستەیەوە هێشتا هەرمابوو.

چەندجارێک لێم نزیک کەوتەوە، دەیزانی تازە لە زیندان هەڵاتووم و ڕۆیشتن، بەتایبەتی بەهەورازدا، سەختە بۆم ، پێشنیاری کرد کە تفەنگەکەم بۆ هەڵبگرێ، لەگەڵ ئەوەشدا کە من تەواو خەستە بووم، شەرمم دەکرد کە ئەوکارە قبووڵ بکەم، چونکە تەنها لە کاتی برینداریدا پێشمەرگە بۆی هەیە کارێکی لەو بابەتە ئەنجام بدات، بۆیە سوپاسێکی زۆرم کرد و مەمنوونی ئەو جوامێرییەی بووم.

هەر بە ڕێگەوە بووین و بە قەدپاڵی شاخەکەدا سەردەکەوتین و هەر نەدەگەیشتین کە جارێکی تر خاڵەنەبەز هاتەوەلام و وتی:

_ پێش ئەوەی بگەینە (خەمزە) کوێرە دێیەک دێتە ڕێگەمان ، گەر حەزدەکەی لەوێ لادەدەین و تۆش پشووی خۆت بدە.

چونکە پرسیارەکە تەنها لە من کرا، منیش ڕازی نەبووم و لە سەر ڕۆیشتن بەردەوام بووم، بەڵام تا دەهات هەنگاوەکانم خاوتر دەبوون کە دەبووە مایەی دواکەوتنی پێشمەرگەکان و لە یەک دابڕانیان . هەرچۆنێک بێت ، منیش هەر بەردەوام بووم.

شاخەکە تا دەهات قووچ تر خۆی دەنواندو بەوپێیەش، سەرکەوتنی، زەحمەتتر دەبوو، نەبەز هاتە وەلام و وەک دڵنەواییەک وتی:

_ هەمووومان لەسەرەتادا وەک تۆ بووین. کاتی دەوێ، تا جەستەت لە سەر ڕەوتی ئەم شاخ و داخە ڕادێیت.

من جگە لە هیلاکی، بنی پێم زریکەی دەکردو دەسووتایەوە. دەتوت چقڵ دەکەن بە ژێر پێمدا و وامدەزانی زەوی ژێر پێم بزمارڕێژ کراوە. دەمزانی بنی پێم هەمووی بووە بە تلۆق، بۆیە هەستم بە ئازارێکی یەکجار زۆر دەکرد.

نازانم ڕێگاکە خۆی هێندە دوور بوو، یان تاریکی و هیلاکی ئاوێتەی یەکدی بووبوون و تا دەهات دێیەکەی لێ دوور دەخستینەوە. چراکانی دێ ، هەر بریسکەی دەهات، بۆیە لە دڵی خۆمدا وتم:

ـ تۆ بڵێی کەی بگەین؟.

بۆ دواجار کە نەبەز هاتەوە لام، ئیتر گومان لەوە نەما کە ناتوانم لەوە زیاتر بڕۆم بۆیە وتم:

ـ دەتوانین لە شوێنێکدا پشوویەک بدەین؟

وەک سەرزەنشتێک وتی:

ـ ئەی نەموت با لەو کوێرە دێیە لابدەین؟

ڕاستی دەکرد، بەڵام من وام دەزانی هێشتا وزەم پێماوە و دەتوانم بڕۆم، بەڵام سەرەڕای شەکەتی جەستەم ، خەویش تینی بۆ هێنابووم بۆیە وتم:

ـ ڕاست دەکەیت، بەڵام ئیتر وزەم پێ نەما.

لە پاڵ داربەڕوویەکدا بۆی ڕاکشام ، پێشمەرگەکانی تریش، بۆ پشوودان، لایان دا . نەمزانی چەندە پاڵ کەوتووم کە هەستم بە سەرمایەکی زۆر دەکرد وامدەزانی درزیە ئاژنم دەکەن. چونکە ڕۆژ کە هەمووی هەر لە جووڵەدا بووین، هەستم بەسەرما تا ئەوکاتە نەکردبوو، بەڵام ئێستا کە عارەقی لەشم وشک ببووەوەو لە جووڵە کەوتبووم، سەرما لەرزی لێهێنابووم بۆیە هەستامە سەرپێ.

تۆزێک هیلاکیم دەرچوو بوو، لەوەش نەدەچوو سەرخەوێکم شکاندبێ

بۆیە بە دەنگی بەرز وتم:

_ من ئامادەی ڕۆیشتنم.

دیار بوو هەموو پێشمەرگەکان خۆشحاڵ بوون، ئەوان دەیانویست بە زووترین کات بگەینە خەمزە و فریای خواردن و خەوێک بکەون.

کاتژمێر دوانزەی شەو گەیشتینە خەمزە.

ئەنوەر کە لە پێشمانەوە دەڕۆیشت، پێش هەموومان گەیشتبووە نێو دێ و چاوەڕێی ئێمەی دەکرد.

نیگایەکی بەزەیی ئامێزی کردم.

*** 

## ١٢

بەیانی دوای بەرچایی، لای مزگەوتی دێ، کۆبووینەوە، یەکەمین فەرمانی ئەنوەر ئەوە بوو کە بە زووترین کات لە دێ دەربچین، ئەویش لەبەر دوو هۆ، یەکەمیان (خەمزە) زۆر نزیک بوو لە رەبایاکانی شاخی ئەزمەڕ و دووەمیش بوونمان لە نێو دێ، بە رۆژ، نیگەرانی دانیشتووانی لێدەکەوتەوە، بۆیە ئێمەش بێ مشتومڕ بەرەو دەرەوەی دێ ملمان نا.

ئێمە لەناو درەختەکانی نزیک دێدا خۆمان حەشار دابوو، کاتێک دیمان دانیشتوویەکی دێ لەگەڵ پێشمەرگەیەکدا بەرەولامان دێن. دیار بوو ئەو گوندییە تەنها بۆ رێنمایی پێشمەرگەو گەیاندنی بە ئێمە پێشی کەوتبوو، بۆیە هەر کە ئێمەی دی ئیتر یەکسەر بۆ ناو دێ گەڕایەوە.

کە نزیک کەوتەوە من هەر زوو ناسیمەوە. مامۆستا عەزیز بوو، کادرێکی چالاکی خاوەن ئەزموون بوو لە ناو کۆمەڵەدا.

لەگەڵیدا دانیشتین، ئەو وتی لە قەرەداخەوە بە مەبەست بۆ ئەمبەر هاتووە، لە پرسیاری ئەوەی چۆن بە تەنیا هاتووە وتی:

ـ بە نهێنی چوومە شارو ڕێکخستن دەلیلیان بۆ پەیدا کردم.

پاشان نامەیەکی پێچراوەی دایە دەست ئەنوەر و ئەویش دەقی نامەکەی بۆ خوێندینەوە.

نامەکە لە کاک ئارام بەرپرسی یەکەمی ڕێکخستنەکانی شار بوو کە لە قەرەداخەوە بۆی ناردبووین. کرۆکی نامەکە باسی ئەوەی دەکرد کە چەک لە سووریاوە هێنراوەتە کوردستان و گەیشتۆتە سێ گۆشەی سنووری (تورکیا) و (ئێران) و (عێراق)، لە ناوچەی خواکورک و داوای کردبوو کە چەند پێشمەرگەیەک لەگەڵ مامۆستا عەزیزدا بچین بۆ هێنانی بەشی کۆمەڵە.

بۆ ئەو مەبەستەش ئەنوەر سەرپشکی کردین کە کێ ئارەزووی هەیە لەگەڵیدا بڕوا.

من حەزمدەکرد ناوچە جیاجیاکانی کوردستان ببینم، بە تایبەتی من ئەو ناوچانەم نەدی بوو، بۆیە هەر زوو رامگەیاند کە من ئامادەم. لەگەڵ منیشدا سێ پێشمەرگەی تر ئامادەگیان نواند، ئەگەرچی ئەنوەر هەوڵی دا لەگەڵم کە من نەڕۆم ، چونکە وتی ڕێگاکە یەکجار دوورە و تۆیش تازە هاتوویتە دەرێ و لە سەر ڕۆیشتنی وا دوور ڕانەهاتوویت. لە وەڵامیدا وتم:

ـ منیش دەزانم، هەر لەبەر ئەوەش حەزدەکەم بۆ ئەوەی بەتەواوی لە سەر ڕۆیشتن ڕابێم.

سەری ڕەزامەندی بۆ لەقاندم و هیچ نارەزاییەکی دەرنەبڕی، بۆیە منیش سوپاسی هەمووانم کردو لەگەڵ پێشمەرگەکان، مامۆستا عەزیز کەوتینە ڕێ.

هێندە نەبوو بە ڕێوە بووین کاتێک دەنگی هالیکۆپتەرێک لە سەرمانەوە دەبیسترا، کەسەرم هەڵبڕی هالیکۆپتەرێکی سەربازی بوو، بە ئاسمانی ناوچەکەدا دەسووڕایەوە. دیار بوو بۆ پێشمەرگە دەگەڕا. من گومانم هەبوو کە دەبێ زانیارییان سەبارەت بە پێشمەرگە دەستکەوتبێت، چونکە ئەوە یەکەمین جار بوو، لەوماوەیەدا، تووشی فڕۆکە بین، بۆیە هەموومان بە پەلە لە نێو درەختەکانی سەر ڕێگادا خۆمان حەشاردا، چەکەکانی شانمان ئەوە نەبوو کە بتوانێت بەرەنگاری فرۆکەیەکی سەربازی بێت، بۆیە خۆ مەلاس دان لە بن درەختێکدا، باشترین چارەسەر بوو.

خۆشبەختانە زۆر بەسەر ئێمەدا نەگەڕاو بەرەو شاخەکانی دەورووبەری (چوارتا) ملی ناو لە چاو ترووکانێکدا، لە چاو ون بوو.

هەموو خۆشحاڵ بووین کە تووشی کارەساتێک نەبووین، بۆیە ئیتر بڕیارمان دا کە ئیدی بە وشیارییەوە ڕێ بکەین، چونکە ئیتر تەنها ڕەباياو سەربازگەکان نەبوون کە دەبوو خۆمانیان لێ بپارێزین، بەڵکو دەبوو ئاگاشمان لە ئاسمان بێت و لە کاتی بیستنی دەنگی فڕۆکەدا، بە زوویی خۆمان حەشار بدەین، ئەی ئەگەر لە چۆڵەوانیدا تووش بووین و نە درەخت و نە پەناگە پەیدا بوایە دەبوو چی بکەین؟ ئەم پرسیارەم لە خۆم کرد و وەڵامم پێ نەبوو.

دەمەو نیوەڕۆ گەیشتینە دێی (گەورەدێ).

لەوێ چەند پێشمەرگەیەکی ترمان دی، لەناویاندا پیاوێک کە تەمەنی سەروو پەنجا ساڵ دەبوو زۆر گورج و گۆڵ و چاپووک هاتە پێش چاوم. خۆی وەک حاجی مەحموود پێ ناساندین. وەک لەمەودوا بۆمان دەرکەوت خۆی خەڵکی ئەو دێیە بوو، لە باسی ئەوەی بە نیازین بەرەو سێ گۆشەی سنوور بڕۆین زانیاری زۆری لا بوو کە بۆ ئێمە زۆر بە

کەڵک و بە نرخ بوون. ئەو وەک شارەزایەک لەگەڵ پێشمەرگەکانی، ویستی خۆیان ڕاگەیاند کە حەزدەکەن ئەوانیش لەگەڵمان بەرەو سێگۆشەی سنوور بێن.

بەو بڕیارەیان زۆر خوشحاڵ بووین، بۆ ئێمەی تازە پێشمەرگە ئەوە وەک موعجیزە وابوو. زۆربەیان لە شۆڕشی ئەیلوولدا بەشدار بوون و ئەزموونی شاخ و شەڕی پارتیزانییان هەبوو، پێکەوە هەموو بووینە (٣٠) پێشمەرگە، بۆیە بڕیارماندا بەیانی زوو پاش خۆئامادەکردن ڕێک بکەوین.

لای عەسر لە سەر ڕێنماییەکانی کاک ئارام کە بۆ ئەو گەشتە دووروو درێژە بێ دڵی خۆمان نەکەین، مامۆستا عەزیز چەند مریشکێکی کڕی و لە یەک دوو ماڵ بۆی ئامادە کردین بۆ ڕێگا. ئەوەش لە سەر پێشنیاری حاجی مەحموود بوو کە پێی وتین:

_ ڕێگا دوورەو دەبێ تێشووی ڕێگاتان پێ بێ.

پاش کەمێک وتی:

_ ئێمەش بۆ پێشمەرگەکانی خۆمان بژێوی ڕێگا لەگەڵ خۆمان دەهێنین.



## ١٤

بەیانی بۆ ڕۆیشتن ئامادە بووین کە وڵاخدارێک گەیشتە لامان و خۆی وەک شێخ سدیق ناساند، ئەو وڵاخێکی بەرزەی پێش خۆی دابوو کلاشینکۆفێکی کردبووە شانی. ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام تەمەنی بوو کە بۆ سەرووی شەست ساڵ دەچوو. لە پرسیاری ئەوەی ئایا هیچ کارێکی بە ئێمە هەیە لە وەڵامدا وتی:

_ منیش پێشمەرگەم ، شەو بیستم بۆ سێگۆشەی سنوور دەچن، منیش حەزدەکەم لەگەڵتان بەرێکەوم.

پێشمەرگە؟! جەستەی لاواز و تەمەنی هەڵکشاوی مایەی تێڕامان بوو. بەڵام مرۆڤ دەتوانێ لەو تەمەنەدا ببێتە پێشمەرگە؟ ئەمە پرسیارێک بوو لە خۆمم کرد. من دەمزانی تەنها گەنج و لاو دەتوانن بەو ئەرکە قورسە هەڵبستن کەچی ئێستا وا تەمەن پەنجاو شەست ساڵ دەبینم کە دەیانەوێ بەشداری لە شۆڕشی نوێدا بکەن.

کە هەموو لە نێو دێ گردبووینەوە حاجی مەحموود هاتە لامان و شێخ سدیقی زیاتر پێناساندین. ئەویش بەشداری شۆڕشی ئەیلوولی کردبوو، بەو پێیە لە ئێمە بەئەزموون تر بوو. ئەوەی کە زۆر خۆشحاڵی کردین،

شارەزایی لە ڕێگەوبانی دێکانی کوردستان بوو. ئەمە بۆ ئێمە زۆر سوودبەخش بوو.

ئەو نان و مریشکەی ئامادەمان کردبوو لە نایلۆندا پێچامانەوەو لە ولاخەکەی شێخ سدیق شەتەکماندا، بەو هیوایەی تا دەگەینە ئاوەدانییەکی تر بەشی خواردنی پێشمەرگەکانمان بکات.

حاجی مەحموود و پێشمەرگەکانی لە پێشەوە کەوتنە ڕێ و ئێمەش بە دوایاندا. لە ڕێگە لە شێخ سدیق نزیک کەوتمەوەو هەندێ پرسیاری ناوچەکەم ئاراستە کرد، بەڵام هەستم کرد باش تێم ناگات کە لەمەودوا بۆم دەرکەوت، گوێچکەی لە ئەنجامی تەقینەوەی بۆمبێکدا، لە نزیکییەوە، تووشی تا ڕادەیەک کەڕی بووە.

ئیتر لە (گەورە دێ)وە بەو شوێنانەی کە ئێمەی پێیدا تێدەپەڕین، ئاوەدانی و هیچ دێیەک نەدەهاتە سەر ڕێگەمان.

حاجی مەحموود هاتە لامان و دڵنیای کردین کە ئەگەرچی ئەوان لە ئێمە خێراتر دەڕۆن، بەڵام ئەوان ئێمە ون ناکەن و هەر بۆ ڕەواندنەوەی نیگەرانیمان حاجی بە دەنگی بەرز وتی:

_ لە دێی «هەڵشۆ» لە ناوچەی پشدەر یەکدی دەبینینەوە.

پاشان بەردەوام بوو:

_ شێخ سدیق شارەزای ڕێگەیە و خەمتان نەبێت لە یەکدی ون نابین.

ئەمەی وت و لەگەڵ گرووپەکەیدا، خێراتر لە ئێمە کەوتنە ڕێ و زۆری نەبرد لەچاو ون بوون.

لە پرسیاری ئەوەی کە ئایا جاریتر شێخ سدیق بەو ڕێگایەدا ڕۆیشتووە، کە من ئەو پرسیارەم زۆر بە دەنگی بەرز لێکرد ، لەوەڵامدا وتی:

ـ بەڵێ .... بەڵێ.

ئەورۆژە هەر هەمووی بە ڕێگەوە بووین، تەنها جارێک لاماندا بۆ نانخواردن کە ئەویش بریتی بوو لە نانی وشک لەگەڵ ئاو. هیچ دەستکاری مریشکەکانمان نەکرد، چونکە وەک پێیان ڕاگەیاندین، ڕێگەیەکی دوورو درێژمان لە پێش بوو کە دەبوو دەست بەو برە ئازووقەیەوە بگرین و لە کاتی تەنگانەدا بیخۆین.

ئەو ناوچەیەی بە ناویدا دەڕۆیشتین (کوێستانی شینکایەتی) بوو، کە بە ڕاستی کوێستان بوو، هەر لە عەسرەوە هەستمان بە گۆڕینی کەشو هەوا کرد، بۆیە ڕۆیشتنەکەمان خێراتر کرد، لەگەڵ ئەوەشدا کە تاریک داهات بە ناچاری لە پاڵ چەند گابەردێکی زەبەلاحدا، لامان داو کەوتینە کۆکردنەوەی پووش و پەلاش کە لەو کوێستانە زۆر نەبوون.

هەرچۆنێک بوو ئاگرێکمان کردەوە و لە دەوری دانیشتین. ئەوەی باش بوو کە ئەم کوێستانە لە ڕەبایاو سەربازگەوە دوور بوو، بۆیە بێ ترس ئەو ئاگرەمان کردەوە، دەنا بۆ پاراستنی گیانی خۆمان نەدەبوو ئەو کارە بکەین.

شەو تا دەهات ساردتر دەبوو، ئێمەش کەسمان نە کیسەی خەو نە بەتانییەکمان پێ بوو، چونکە هەڵگرتنی بەتانی کارێکی یەکجار زەحمەت و بارگرانییەک بوو بۆ پێشمەرگە. لەبەر ئەوە هەموو پشتمان کردە ئاگرەکەو تا بەرەبەیان لێی پاڵ کەوتین. شەوێکی یەکجار ساردو درێژ، ئەمە سەرەڕای ئەوەی لە نانی وشک زیاترمان نەخوارد. تێشووی سەر وڵاخەکەی شێخ سدیق مان بۆ تەنگانە دانابوو.

بەیانی کەوتینەوە ڕێ و بەرەو شاخی (ئاسۆس) بەڕێکەوتین. هەرچەند لەسەر ڕۆیشتن برێک باشتر بووبووم، بەڵام سەرکەوتن بە سەر شاخی (ئاسۆس) بۆ من گەلێک سەخت بوو.

دەمەو نیوەڕۆ لە دێ یەک نزیک ڕووباری ئاسۆس لاماندا و نانێکی بە پەلەمان خوارد، چونکە ناوچەکە پڕ بوو لە سەربازگە و ڕەبایا.

دەبوو لە ئاوەکە کە زۆر بە تەوژم دەڕۆیشت و مۆڵەتی بواری نەدەدا ، کەڵەک پەیدا بکەین. هەر بۆ ئەو مەبەستەش لە دێ، کە کەڵەکەوانێکمان چنگ کەوت و یارمەتی داین بۆ پەڕینەوە.

وڵاخەکەی شێخ سدیق بە بارەکەوە لە بواری دا. ئیدی هەموو هاتبووینە ناوچەی پشدەر و دەبوو زۆر بە وشیارییەوە ڕەوت بکەین. بەلای دێی (نورەدین) دا تێپەڕین و لامان نەدا، هەرچەند برسێتیش تینی بۆهێنابووین.

ئەگەرچی لەمەودا ڕێگەکە ئاسانتر خۆی دەنواند و وەک کوێستانی شینکایەتی سەخت نەبوو لەگەڵ ئەوەشدا مەترسی زیاتر بوو. ڕژێم هەموو پشدەری وەک سەربازگەیەکی گەورە لێکردبو، لە هەموو گردو تەپۆڵکەیەک، ڕەبییەیەک بەدی دەکرا ، کە دەبوو زۆر بە ئاگاوە بەلایدا تێپەڕین.

خۆشبەختانە هیچ نەهاتە ڕێگەمان و لای عەسر گەیشتینە دێی (هەڵشۆ) بەڵام لەوێش لامان نەدا، بەڵکو بەردەوام بووین بۆ دەرەوەی دێ و لە پاڵ شاخی (هەڵشۆ) دا هەوارمان خست.

لەوێ حاجی مەحمود و پێشمەرگەکانی تر چاوەڕوانیان دەکردین و خۆشحاڵی خۆیان نیشاندا. لەو قەدپاڵەدا تێبینی ئەوەمان کرد کە جگە لە پێشمەرگەکان، وڵاخدارێکی زۆر لەوێ دانیشتبوون. کە پرسیاری ئەوەم کرد ئەمانە کێن؟، حاجی مەحموود لەوەڵامدا وتی:

__ ئەمانە هەموو قاچاخچین و لە ئێرانەوە کاڵا دێنن و لە کوردستانیشەوە چای عیراقی دەبەن.

سەرم سوڕما و لە بوێری ئەوانە تێنەدەگەیشتم کە چۆن دەوێرن بەناو ئەو هەموو سەربازگانەدا کاری قاچاخ بکەن. حاجی وتی:

ـ زۆر شارەزان و لە کون و کەلەبەری ئەم ناوچەیە ئاگادارن.

لە راستیدا هیلاک بووبووین و برسێتی تینی بۆ هێنابووین بۆیە مامۆستا عەزیز پێشنیاری کرد کە ئیتر کاتی ئەوە هاتووە کە نانێکی باش بخۆین.

شێخ سدیق پشتیوانی لە پڕیارەکەی مامۆستا کرد و وتی:

ـ شاخێکی سەختمان لە پێشە و پێویستی بە خواردنێکی باش و وزەبزوێن هەیە.

ئەوەی وت و بەرەو لای وڵاخەکەی رۆیشت و بارە نانەکەی بۆ داگرتین.

هەر کە نایلۆنەکانی لە نانەکە کردەوە، بۆن خەریک بوو کوێرمان بکات.

خواردنەکەمان هێند توند و نەشارەزایانە پێچابووەوە کە زۆر دەمێک بوو ترشابوو . هیچ سوودێکمان لەو نانە وەرنەگرت، کە زۆر دەمێک بوو بە پەرۆشەوە چاوەڕێی خواردنیمان دەکرد.

❊❊❊

## ١٥

کەسمان نەمانتوانی توخنی ئەو خواردنە بکەوین، چونکە بە ڕادەیەک خراپ بووبوو کە بە هیچ جۆرێک بە کەڵکی خواردن نەدەهات.

لەراستیدا، هیچی تریشمان پێ نەبوو، بۆیە هەر زوو پێشمەرگەکانی لای حاجی مەحموود و قاچاقچییەکانیش هەستیان بەوەکرد، بۆیە هەریەک لای خۆیەوە کەوتنە کۆمەکمان. حاجی چەند نانێک و برێک پەنیری پێستەی بۆ هێناین، قاچاخچییەکانیش نان و پیازو هێلکەی کوڵاویان بۆ هێناین کە بۆ ئێمە لەوساتەدا ژەمێکی بێ وێنە بوو.

حاجی لامانەوە دانیشت و باسی ئەوەی بۆ کردین کە بۆ ڕێگەی دوور نان و پەنیر، بە تایبەتی پەنیری پێستە باشترین خواردنە، چونکە دەتوانرێ بۆ ماوەیەکی زۆر هەڵبگیرێ و خراپیش نەبێت.

ئێمە، جگە لە شێخ سدیق، هەموو خەڵکی شار بووین و هیچ ئەزموونێکمان لەوبارەیە نەبوو. حاجی مەحموود وتی:

_ لەداهاتوودا هەرگیز گۆشت بە گەرمی نەپێچنەوە، چونکە زۆر بە زوویی خراپ دەبێ و دەترشێت.

شێخ سدیق سەری ڕەزامەندی بۆ دەلەقاند، دیارە ئەویش شارەزایی ژیانی شاخ و گوند بوو، بەڵام بۆ ئێمە ژیانێکی نوێ بوو، ئەی ئەو بۆ پێی نەوتین؟.

پاش نانخواردن کەوتینەوە ڕێ. حاجی مەحموود لە کاتی ڕۆیشتندا پێی وتین :

_ دیداری داهاتوومان لە (نۆکان) دەبێ.

ئەمەی وت و خۆی و گرووپەکەی پێشمان کەوتن. دیار بوو ئەوەی بۆیە پێوتین، چونکە دەیزانی ئەوان لە ئێمە خێراتر دەڕۆن و پێش ئێمە دەگەنە شوێنی مەبەست.

دەبوو بە شاخەکەی پشتی (هەڵشۆ) دا سەربکەوین، شاخێکی یەکجار بەرزو قووچ .

بە هەرحاڵ ئێمەش ڕێچکەمان بەست. شێخ سدیق بە دەنگی بەرز پێی وتین:

_ هیوادارم پێش تاریک بوون بگەینە ئەو دیو.

ئەو دێو، دیارە مەبەستی دیوی ئێران بوو، وەک باس دەکرا ئەم شاخە سنووری ئێران بوو.

سەرکەوتن بەو شاخەدا کارێکی یەکجار وزەبەزێن و تاقەت پڕووکێن بوو. ڕێگەی پێچاوپێچی شاخەکە هێند لە یەکدییەوە نزیک بوون ، کە هیچ مۆڵەتی پشووی نەدەدا. گوێم لە هەناسە بڕکێی هەمووان بوو، بەڵام هەمووش بێدەنگ بووین.

بۆ ئێمە مایەی خۆشحاڵی بوو کە دەچووینە دیوی ئێران، چونکە لە سەربازگەو رەبایاکانی رژێم دوور دەکەوتینەوە، بەڵام لە لایەکی تریشەوە ئەو کارەمان هەر مەترسیدار بوو، چونکە گەر رژێمی شای ئێران درکی بە بوونمان لە خاکی ئێراندا بە چەکەوە بکردایە ئەوا یان تووشی شەڕ دەبووین، کە ئێمە خوازیاری نەبووین، یان گەر بگیریانیایە، ئەوا بە پێی ئەو رێکەوتننامەیەی لەنێوان عێراق و ئێراندا کرابوو، ئەوا تەسلیمی عێراق دەکراینەوە بۆیە کاتێک گەیشتینە سەر لووتکەی شاخەکە، هێشتا بە تەواوی رۆژئاوا نەبوو بوو، لەوێوە ئاسمانی مسرەنگی سەر شاخی ئاسۆس بەدی دەکرا.

شێخ سدیق وتی:

_ ئیتر لێرەوە خاکی ئێرانە.

ئێمە خۆمان هەرگیز دانمان بە سنووردا نەدەناو بە کارێکی دەستکردمان لەقەڵەم دەدا، بەڵام لە رووی یاساییەوە وڵاتێکی تر بوو، بۆیە دەبوو زۆر بە هۆشیارییەوە رەوت بکەین و نەهێڵین بکەوینە بەردەستی سەربازانی شای ئێران.

شێخ سدیق پێش ئەوەی داگەڕێین وتی:

_ من شارەزای ئەم رێگەو بانەم و هیچ ترستان نەبێت.

ئەوەش هەر بۆ ئێمە هەواڵێکی خۆش بوو، لەوێوە سەیری دیمەنی بەرانبەرم کرد، لەراستیدا هیچ جیاوازییەک نەبوو ، تەنها ئەوە نەبێ کە بەم دیودا دارو درەخت زیاتر دەبینراو وەک دیوی خۆمان رووتەنی نەبوو.

ئەوەی مایەی خۆشحاڵیمان بوو، لە ئێراندا رەبایا نەبوو، تەنها

سەربازگە بوو، بۆیە دەمانتوانی بە ئاسانی خۆمانی لێ لابدەین و تووشیان نەبین.

ئەوەی باش بوو ئەمدیو یەکجار وا سەخت نەبوو، وەک ئەوە وابوو بە گردێکدا شۆڕ بینەوە.

ڕۆیشتنەکەی خۆشم لە چاو ڕۆژانی پێشوودا، زۆر باشتر بووبوو، بەو شێوەیە هەستم بە هیلاکی نەدەکرد، ئەگەرچی هەر هەستم بە برسێتی دەکرد، بەڵام نزیکبوونەوەمان لە دێی (بنەخەڵەف) مایەی خۆشحاڵی بوو. شێخ سدیق ئەوەی پێ ڕاگەیاندین.

لێرە لە (بنەخەڵەف) دەمانتوانی شەوەکە بە ئاسوودەیی بەرینە سەر و ترسی سەربازو سوپامان نەبێت.

دانیشتووانی ئاوایی پێشوازییەکی گەرمیان لێکردین و گەلێ بە بینینمان، وەکو پێشمەرگە، خۆشحاڵ بوون. بۆ ئەوانیش هەواڵێکی نوێ بوو، کە خەبات و بەرەنگاری لە کوردستانی عێراق دەستیپێکردۆتەوە.

ئەو شەوە میواندارییەکی بێ وێنەیان کردین. بۆ یەکەمجار شیوێکی گەرم و پێخەفێکی نەرم بوو بە نەسیبمان.

وەک شێخ سدیق پێی ڕاگەیاندین، لێرە پێویست بە پاسەوانی نەبوو، چونکە ناو دێ نە سەرباز و نە لە نزیکیشیەوە سەربازگە هەبوو.

بۆیە ئەو شەوە زۆر بە ئاسوودەیی لێی نووستین.

* * *

## ١٦

له تەق و هۆڕی ماڵەکە خەبەرم بووەوە. دنیا رووناک ببوو، هەستم بە ئاسوودەیی دەکرد، هیلاکی گیانم بە تەواوی نەمابوو. ئەوە یەکەمین جار بوو دوای ئەو ماوە درێژە، لە ژوورێکی گەرم و گوڕدا بە بێ ترس و نیگەرانی بخەوم و پشووی تەواو بدەم.

کەیبانووی ماڵ زۆر بە گەرمی بەخێرهاتنی کردم، دیارە شەو من ئەوم نەدیبوو.

لەگەڵ خاوەن ماڵدا پێکەوە لە دەوری سینییەک شیوی گەرم کۆبووینەوە. خواردنەکە گەنم و ماش بوو، هەڵاوی گەرمی_ لەو بەیانییە ساردەدا_ لێهەڵدەسا. لە راستیدا ئەوەش یەکەمین بەیانی بوو، کە خواردنێکی گەرم بخۆم. دەمزانی رێی دوورمان لە پێشە بۆیە لە خواردن درێغیم نەکرد. خاوەن ماڵ هەندێ پرسیاری دیوی خۆمانی لێکردم و زۆر خۆشحاڵ بوو بەوەی کە شۆڕشمان دەستپێکردۆتەوەو بەردەوامین لە سەر خەبات. ئەوان هیوایەکی زۆریان بە ئێمە بوو، سەرکەوتنی ئێمەیان بە هی خۆیان دەزانی.

لە پرسیاری ئەوەی کە ئایا سەربازگە دێتە رێمان، لە وەڵامدا وتی:

_ تەنها لە چەند شوێنێکی نزیک سەردەشت هەندێ (پادگان) هەیە.

لەبەر پیری و تەمەنی سواری وڵاخەکەی ببوو. لە راستیدا توانای یاشێخ، لەو تەمەنەدا، مایەی سەرسوڕمان بوو. شەست ساڵ تەمەن بۆ لادێکانی کوردستان تەمەنێکی درێژ بوو، بە تایبەتی بتوانی ببیتە پێشمەرگە.

لە پرسیاری ئەوەی بە چەندی تر دەگەینە مەنزڵ، شێخ وتی هیوادارە پێش تاریکی بگەین ئەگەر زیاتر دەست و برد بکەین.

هەموو باش دەڕۆیشتین و بەبەردەوامی بەڕێوە بووین و لەو رێگەیەش، هیچ پشوویەکمان نەدا.

رۆژ وردە وردە بەرەوئاوابوون دەچوو، بەڵام لە ئاسۆدا هیچ دێیەک بەدی نەدەکرا. حەزمان نەکرد پرسیاری دی لە شێخ بکەین و لە نەگەیشتنمان سەرزەنشتی بکەین.

کە بەتەواوی رۆژئاوا بوو ، کزە بایەکی یەکجار سارد هەڵی کرد، ئەگەرچی لەشمان، لە ئەنجامی رۆیشتن، گەرم داهاتبوو، بەڵام هەر هەستمان بە سەرما دەکرد.

تاریک داهات و نەگەیشتین، لەگەڵ ئەوەشدا کەسمان پرسیارمان نەکرد. نازانم چەندی تر بەڕێوە بووین، کە ترووسکاییەک لە دوورەوە دەرکەوت و یا شێخ بە دەنگی بەرز پێی وتین:

ـ کوڕینە ئەوەش (نۆکان).

خۆشحاڵی لەسەروپۆتەلاکی شێخ سدیق دەتکا.

***

## ١٧

«نۆکان» دەکەوتە ناو خاکی ئێرانەوە، بۆ ئێمە جێی سەرسوڕمان بوو، کە بارەگای پێشمەرگەی لێ بێت، من زۆر تامەزرۆ بووم لە نهێنی ئەو کارە بگەم. ئێمە نەماندەتوانی لە نێو کوردستانی عێراقدا بنکەو بارەگا دابنێین و هەمیشە لە جووڵەدا بووین.

بەرپرسی بارەگاکە کە خۆی وەکو (تالیب) ناساند و پێشمەرگەکانی پێشکەش کردین، من لەوەوپێش دەمناسی و لە شاردا کاری مامۆستایی دەکرد، بەڵام ئەو لە ئێمە زووتر چوو بووە دەرەوەو ببوو بە پێشمەرگە.

تالیب خۆشحاڵی خۆی بە بینینم نیشاندا. دیار بوو داستانی هەڵاتنی منی لە (زیندانی هەیئە) بیستبوو، چونکە یەکسەر وتی:

ـ دەبێ ئەمشەو باسی ئەو دەربازبوونەتم بۆ بکەی.

منیش هەڤاڵانم یەک یەک پێ ناساند. دیار بوو شێخ سدیقیش ئەوی دەناسی، چونکە زۆر بە گەرمی هەواڵی یەکدیان دەپرسی.

ئەو شەوە لای ئەو ماینەوە و نانێکی پێشمەرگانە کە بریتی بوو لە نان و نیسکێنەی پێشکەش کردین کە بۆ ئێمەی برسی، گەلێک لە

جێی خۆیدا بوو.

تالیب، جگە لە بارەگاکەی خۆی، چەند خانوویەکی قوڕینەی بۆ پێشمەرگەکانی دروست کردبوو.

لە کاتی خەوتندا منی جیا کردەوەو وتی:

ـ ئەمشەو لای من بەویا پێشمەرگەکان لای برادەران بنوون.

منیش ئەو پێشنیارەم پێ خۆش بوو، چونکە ئیتر دەمانتوانی پێکەوە باسی شارو پێشمەرگایەتی و کارو چالاکیيان بکەین. من هەر زوو سەرسوڕمانی خۆمم بەرامبەر ئەوە نیشاندا، کە چۆن دەتوانن، لە نێو خاکی ئێراندا، بارەگای پێشمەرگە دابنێن . ئەو لە وەڵامدا وتی:

ـ راستە ئەمە خاکی ئێرانە، بەڵام ئێرە دوایین دێی سنووری ئەم ناوچەیەیە و هێندیش لە سنووری عێراقەوە دوور نییە، خۆت بەیانی بە رووناکی ناوچەکە دەبینیت.

هەروەک باسی کرد، تەنها چەمێک لە نێوان هەردوو سنووردا هەبوو کە لە چەند مەترێک زیاتر نەدەبوو.

ئیدی ئەو کەوتە پرسیار لە من و لە چۆنیەتی گرتن و لەمەودوا هەڵاتنم لە زیندانی کەرکووک. منیش بەدوورو درێژی هەموویم بۆ گێڕایەوەو تا درەنگانی شەو پێکەوە دانیشتین کە ئەو هەستی بە خەواڵوو بوونم کرد، چونکە وتی:

ـ رێگەیەکی دوورتان لە پێشە و پێویستە پشوویەکی باش بدەیت.

ئیدی هەریەک لە جێی خۆی، بۆی راکشاین. ژوورەکە سارد و سڕ بوو، پێخەفەکانیش پێشمەرگانە بوون، بۆیە من هەر بە جلەوە لێی پاڵ کەوتم و خۆم گرمۆڵە کرد.

شەو چەند جارێک هەستاو سەری دەرەوەی دا، دیار بوو لە بەر نزیکی بارەگاکەی لە سنووری عێراقەوە دەیویست خۆی ئاگای لە بارودۆخەکە بێت.

بەیانی زوو هەستاین و پاش نانخواردن، تالیب پێشنیاری بۆ کردین کە سەرێک لە کۆمەڵە کوێخایەک کە تازە لە ناوچەی قەڵادزێوە هاتبوونە نێو پێشمەرگە بدەین و باسی ناوچەی خۆمان و چالاکی پێشمەرگەیان بۆ بکەین. دیار بوو تالیب دەیویست ورەی کوێخاکان بەرز بکاتەوە، چونکە ئەوانە هەموو لە تەمەندا بوون و دیار بوو کە ناچار کراون پەنا بۆ پێشمەرگە بهێنن و بێنە شاخ.

کوێخاکان خوشحاڵی خۆیان بە بینینمان نیشاندا و ئێمەش، من و مامۆستا عەزیز و شێخ سدیق، هەریەکەو چەند زانیارییمان لە ناوچەکانی خۆمان هەبوو، بۆمان باسکردن کە بە تامەزرۆییەوە گوێیان بۆ شل دەکرد و جارو بار پرسیاریان ئاراستە دەکردین. تا لای نیوەڕۆ لای ئەوان بووین و کە ویستمان بڕۆین و باسی ڕێگەی دووری خۆمان کرد، ئیدی ئەوان سوور بوون لە سەر ئەوەی کە دەبێ نانی نیوەڕۆ لەگەڵیان بخۆین و ئینجا ڕێبکەوین.

لەراستیدا ئێمەش پێمان خۆش بوو، بەتایبەتی دەمانویست زانیاری پێویست سەبارەت بە ڕێگەکە بەتایبەتی تێپەڕبوون بە شاخی قەندیلدا کە شاخێکی یەکجار سەخت و بەرز بوو پەیدا بکەین.

ئەوان لە کاتی نانخواردندا هەریەکەو ئەوندەی زانیاری لابوو پێی ڕاگەیاندین کە زانیاری بە کەڵک بوون بۆ ئێمە. ئەوان وتیان لێرە کە کەوتینە ڕێ ئیدی ئاوەدانی نایەتە ڕێگەمان تا بارەگایەکی تری پێشمەرگە کە دەکەوتە نزیک شارۆچکەی (خانە).

ئەوان مەزندەی ڕێگەکەیان بۆ ئێمە دیاری کرد و دەیانووت گەر دوای

نانخواردن  بەرێبکەوین بۆ لای ئێوارە دەگەینە ئەو بارەگایە، هەرچەند ئەوەیان دووپات کردەوە کە دەبێ باش بڕۆین.

شێخ سدیق مشووری هەندێک ئاردو شەکر و برێ نانی بۆ خواردن، وەک تێشووی رێگا، بۆ ئامادە کردین و لە ولاّخەکەی بەست. ئەزموونی رێگەمان، ئەوەی پیشاندا‌ین کە ئیدی خواردنی گەرم بۆ رێگە نەبەین، بۆیە بەو شەکرو ئاردە قایل بووین.

پێش ئەوەی بکەوینە رێ ، یەکێک لە کوێخاکان پێشنیاری ئەوەی بۆ کردین کە چادرێکی هەیە و دەتوانێ پێمان بفرۆشێ چونکە دڵنیا بوو لە رێگە پێویستمان دەبێت. لە راستیدا هەموو ئەو پێشنیارەمان لا پەسەند بوو، چونکە وەرز بەرەو زستان دەچوو، ئێمەش روومان دەکردە ساردترین و سەختترین شوێنی کوردستان. مامۆستا عەزیز برێ پارەی پێبوو بۆیە توانیمان چادرەکە بکرین.

هەرچەند کەسیشمان شارەزاییمان لە هەڵدانی چادر نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا، بە کارێکی قورسمان نەزانی، بە تایبەتی شێخ سدیق کە وتی ئەزموونی چادر هەڵدانی هەیە.

چادرەکەشمان لە ولاّخەکەی یاشێخ بەست و کەوتینە رێ. سەرم بەرز کردەوە هەور وردەوردە بەری ئاسمانی دەگرت.

❊❊❊

## ١٨

پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ بوو، حەزم نەدەکرد بەو درەنگانە بەڕێبکەوین، بەڵام شەرمم کرد ئەوە بدرکێنم . کوێخاکان شوێنەکەیان وا بۆ نزیک کردینەوە کە نەدەبوو خۆمان چیتر دوابخەین، هەر چەند دەیانوت، گەر بە باشی بڕۆن.

بە ناو شاخ و داخ و هەڵەت و رەقەنی و درک و داڵدا، هەر دەتوانرا بەو شێوەیەی کە دەڕۆیشتین بڕۆین. خۆ نەماندەتوانی وەک ئەوان دەیانگوت غار بدەین.

کەوتینە رێ و وردە وردە ئاوەدانی دیار نەدەما و هەواش تا دەهات ساردتر دەبوو. جاروبار سەرم بۆ ئاسمان هەڵدەبڕی. هەور تا دەهات خەستتر خۆی دەنواند. شێخ سدیق و وڵاخەکەی لە پێشەوەو ئێمەش بە دوای یەکدیدا دەڕۆیشتین. نازانم چەند بوو دەڕۆیشتین کە وردە وردە هەستم بە پروشەی بەفر دەکرد. سەری شاخەکان هەمووی بەفر بوون، قەندیل بە هاوینیش بەفری لێ نابڕێ ، ئەمەم زۆر بیستبوو، بۆیە لە دڵی خۆمدا وتم رەنگە بەفری سەر شاخەکان بێت و با دەیهێنێ، بەڵام لە راستیدا، پروشەی بەفر، تا دەهات زیادی دەکرد، بۆیە بە دەنگی بەرز پرسیارم لە شێخ کرد:

_ یا شێخ ئەوە بەفر دەبارێ، یان پرووشەی بەفرە؟

هیچ ... شێخ هەر گوێی لە من نەبوو، بۆیە هەمان پرسیارم لە ماموستا عەزیز کرد، ئەویش سەری بۆ ئاسمان بەرز کردەوەو پاش کەمێک وتی:

_ منیش نازانم کامیانە!.

بۆیە چوومە نزیک شێخ سدیق و قیڕاندم بە گوێیدا:

_ یا شێخ ئەمە بەفرە دەبارێ؟

باش بوو ئەمجارە گوێی لێم بوو، چونکە وتی:

_ لەوە دەچێ.

چاوەڕێی روونکردنەوەی زیاتر بووم ، بەڵام ئەو لەسەری نەڕۆیشت و لەسەر رۆیشتن بەردەوام بوو. پێشمەرگەکانیش نیگەرانیی خۆیان بۆ دەربڕیم، بەڵام ئەوانیش هیچ ناڕەزاییەکی ئاشکرایان دەرنەبڕی، بۆیە هەموو بێ مشتو مڕ بەردەوام بووین.

تا دەهات تاریکی تەنگی بە رووناکی هەڵدەچنی و دەوروبەرمان ناڕوون دەبوو، بەفرەکەش لە پرووشە تێپەڕی کردبوو، بە ئاشکرا دەباری. ئیدی هیچ گومان نەما کە ئەمەی روودەدا، بەفر بارینە. ناوەڕاستی مانگی ئۆکتۆبەر بوو، بۆیە بۆ ئەو ناوچە شاخاوییە کارێکی چاوەڕواننەکراو نەبوو. شێخ سدیق لە پڕێکدا وەستاو رووی تێکردین و وتی:

_ کوڕینە ئەمە بەفر بارینە، بۆیە دەبێ تا بە تەواوی تاریک دایە بڕۆین و لە کوێ توانای بینین نەما، لا دەدەین تا بەیانی.

وەک پێیان راگەیاندبووین، هیچ ئاوەدانییەک نەدەهاتە رێگەمان، بۆیە نەماندەزانی لە کوێ لابدەین ، هەر بۆیەش هەموو گوێڕایەڵی

پێشنیارەکەی شێخ بووین و بێ ورتە لە پشتیەوە دەڕۆیشتین.

بەفر تا دەهات خەستتر دەباری، بەرادەیەک کە هەموو دەوروبەرمان سپی هەڵگەڕا و هیچ پەناگەیەکیش نەهاتە ڕێگەمان کە بەکەڵکی لادان و حەوانەوە بێت. کە تەواو تاریک داهات تەنها کلوی بەفرە سپییەکان دەبینران، شێخ وەستاو وتی ئیتر با لا بدەین.

لە ڕاستیدا ئێمە بە ناو دۆڵی قەندیل دا دەڕۆیشتین، بە تەنیشت جۆگەلە، کە سەرەوخوار ملی دەنا و ئێمەش بە کەناریدا ڕەوتمان دەکرد.

شێخ وتی:

_ چادرەکە بکەنەوە با هەڵیبدەین و ئەمشەو لە ژێریدا پشوویەک بدەین و بەیانیش خوا کەریمە.

هەموو دەست و برد بە خۆشحاڵییەوە چادرەکەمان داگرت. مامۆستا عەزیز کە ببوە خاوەنی چادرەکە، لە هەموومان زیاتر تامەزرۆی هەڵدانی بوو. کە چادرەکەمان کردەوە و هەریەکەو جەمسەرێکیمان گرت، هیچی لێ حاڵی نەبووین. چەند دارێکی کورتی لەگەڵدا بوو، دەبوو بیچەقێنی بە دەوری چادرەکەدا، کە لەو ڕەقەنی یەدا کارێکی ئەستەم بوو.نە چەکوشمان پێ بوو نە هیچ ئامێرێک، بۆیە بە قۆنداغی تفەنگەکان کەوتینە داکوتانی دارەکان. هەرچی هەوڵمان دا چادرەکە خۆی نەدەگرت و بەفریش تا دەهات زیادی دەکرد. بە پێی وەستانیشمان هەستمان بە سەرمایەکی زۆر دەکرد.

هەموو هەوڵەکانمان بۆ هەڵدانی چادرەکە سەرنەکەوتوو بوو. نەشارەزاییمان هاواری دەکرد. دوای هەوڵدانێکی زۆر، لەو ڕاستییە گەیشتین کە چادرەکەمان، بە نوقسانی پێدراوە، چونکە ئەوەی کە دەیتوانی چادرەکە لە سەر پێ ڕابگرێ دارێکی درێژ بوو کە دەبوو بخرێتە ژێر چەقی چادرەکە کە لەگەڵیدا نەبوو. بێ ئەو دارەش کە پێی

دەوترا _ وەک شێخ وتی _ ئەستوندەک، بە هیچ جۆرێک نەدەتوانرا، چادر هەڵبدرێ. مامۆستا عەزیز لە داخی ئەو دەستبڕینەی کوێخاکان، هەرچی جنێوی کوردی لەبەر بوو، لە رستەدا بەکاری هێنا، بەڵام بێ سوود بوو. کاتێک هەموو گەیشتینە ئەو راستییەی کە ناتوانرێ چادرەکە لە سەر پێ رابگیرێ، من پێشنیارم بۆ کردن کە بۆ هەموو نەچینە ژێر چادرەکەو بیدەین بە سەرخۆماندا، هەر نەبێ لە بەفرەکە دەمانپارێزێ و دەتوانین تا رۆژ دەبێتەوە لە ژێریدا بحەوینەوە.

هەموو پێشنیارەکەیان لا پەسەند بوو، چونکە هیچ کارێکی تر نەدەکراو زیاتر خۆ ئاڵۆزکردن بە هەڵدانی چادرەکە، تەنها بەفیرۆدانی کات بوو کە دەبووە مایەی زیاتر سەرما بوونمان و تەڕ بوونمان.

لە راستیدا لەو کارەی کوێخاکان نەگەیشتین کە بۆ بەو شێوەیە دەستخەڕۆیان کردین. ئەوان دەیانزانی، ئێمە بەو درەنگ عەسرە، ناگەینە بارەگای داهاتوو ئیدی بۆ وا پاڵیان پێوەناین و نەیانهێشت ئەو شەوەش لایان بمێنینەوەو رۆژی داهاتوو بە زوویی بکەوینە رێ.

ئەمە سەرەڕای فرۆشتنی ئەو چادرە بێ کەڵکەی، پێیان فرۆشتین، کە هیچ سوودێکی بە ئێمە نەدەگەیاند و تەنها بار قورسییەکی بۆ زیاد کردین. تازە هیچ گلەیی و گازندەیەک بە دەردی نەدەخواردین و بیر کردنەوەش لەو هەڵەیەی پێمان کرا ، دادی نەدەداین.

شێخ سدیق خەریکی وڵاخەکەی بوو، لە خورجەکەیدا هەندێ نانە وشکەی دەرهێناو بە سەرماندا دابەشی کرد و ئێمەش لە ژێر چادرەکەدا، بە تاریکی کەوتینە جوینی نانە رەقە.



## ١٩

هەموو لە ژێر چادرەکەدا دانیشتبووین، لەبەر تاریکیش یەکترمان نەدەدی. جاروبار شێخ سدیق چەرخەکەی گیرفانی دەردەهێناو بۆ ساتێک دەوروبەری رۆشن دەکردەوە. لەوساتەدا بە وردی سەیری سەرو پۆتەڵاکی پێشمەرگەکانم دەکرد. هەموو لە مۆمیا دەچوون ، تەنیا بە هەناسەدان هەست بە زیندووبوونیان دەکرا. کە چەرخەکەش دەکوژایەوە ئیدی تاریکییەکی گۆڕ ئاسا باڵی بە سەرماندا دەکێشا و هێندەی تر دەورووبەری مەترسیدار دەکرد.

یەکێک لە پێشمەرگەکان هەر بۆ دۆزینەوەی بابەتێک کە لەسەری بدوێین وتی:

_ ئەرێ ئەمشەو پێویستمان بە پاسەوانی نییە؟

گومانم نەبوو کە رایدەبوارد، دەنا لە ئێمە زیاتر، لەو کەژو کێوە سارده دوورەدەستە کەسی تری لێبوو؟ تا پێویستمان بە پاسەوانی بێت. بڕوام وایە لەوشەوەدا لە ئێمە زیاتر، هیچ زیندەوەرێک لەو دەورووبەره نەبوو. کێ لە ئێمە زیاتر خۆی تووشی ئەو نادیارییە دەکرد، ئەگەرچی ئەوە بە تەنیا هەڵەی ئێمە نەبوو. ئەوانەی رێنماییان کردین دەبوو

تۆزێ بە ویژدانەوە باسی رێگەکەو سەختی و دووری رێگەوبانەکەمان بۆ بکەن، نەکو وا بە سووکی و ئاسانی پیشانی ئێمەی بدەن کە پێچەوانە دەرچوو.

هەوا تا دەهات ساردتری دەکرد و بەفریش سەختتر دەباری. جاروبار لکی چادرەکەم بەرز دەکردەوەو برێک دەمروانییە دەوروبەرمان، دەرەوە بە هۆی بەفرەکەوە رووناکتر دەینواند. هەموو جارێکیش کە ئەو جوولەیەم دەکرد نارەزایییەتێکی زۆر دەبیسترا، کە بۆ ژێر چادرەکە سارد دەکەمەوە. لە راستیدا لە سەر هەق بوون، بەڵام منیش بۆ هەناسەدان و بینینی دەوروبەر ناچار بووم و گلەییەکانم قبووڵ دەکرد.

کات نەدەڕۆیشت، دەتوت زەمان وەستاوەو ئەو شەوە کۆتایی نەدەهات.

مامۆستا عەزیز پرسیاری ئەوەی لە شێخ سدیق کرد کە گوایە هیچ دارو کۆتەرەیەک لەم دەوروبەرە دەست ناکەوێت پەیدای بکەین و بیسووتێنین و خۆمانی پێ گەرم بکەینەوە. شێخ لەوەڵامدا وتی:

ـ ئەم قەندیلە رووتەنییە و جگە لە گوێنی، هیچ دارێکی لێ ناڕوێت، بۆیە بڕوا ناکەم کۆتەرەدار لەم نزیکانە پەیدا ببێ.

گوێنی ناوێکی نوێ بوو بۆمان، من هەر لەوەوپێش ناوی وام هەر نەبیستبوو، بۆیە زیاتر منیش خۆم خستە نێو وتووێژەکەیانەوەو وتم:

ـ دەی با بچین تۆزێ لەو گوێنی یە بهێنین و بیسووتێنین.

لە وەڵامدا شێخ وتی:

ـ ئەوە کارێکی زۆر زەحمەتە، نە وا بە ئاسانی لێدەکرێتەوە نە دەتوانرێ بشسووتێنرێ.

لای هەمووان وەڵامێکی سەیر بوو، چۆن دار ناتوانرێ ببڕێتەوە لە بندا و هەڵبکێشرێ و چۆن ناشسووتێت. ئێمە ئەوەمان وا لێکدایەوە کە شێخ حەز نەکات لە ژێر چادرەکە ببزوێین و بن چادرەکە سارد بکەینەوە، بەڵام هیچ گوێمان نەدایە و بە مامۆستا عەزیزم وت:

_ لە بری ئەوەی لە بەر سەرما رەق هەڵێین، بۆ هەوڵێک پێکەوە نەدەین و بزانین شتێ نادۆزینەوە و ئەمشەو خۆمانی پێ گەرم بکەینەوە.

عەزیز یەکسەر ئامادەگی خۆی نیشاندا، بەڵام ئەوانی تر دیار بوو وتەکانی شێخ قەناعەتی پێ هێنابوون، بۆیە ئەوان لە جێی خۆیان نەبزوان.

من و مامۆستا عەزیز چووینە دەرەوەی چادرەکە، چ سەرمایەک و چ خەستە بەفرێک دەباری. بە دەوروبەری خۆمان روانیمان ، هیچی وا نەهاتە پێش چاومان کە بە کەڵکی سووتان بێت. تەنها ئەو دەوەنانە نەبێت کە شێخ سدیق ناوی لێنابوو گوێنی.

بە حەربەی کلاشینکۆفەکەم کەوتمە بڕینەوەی بنی دەوەنێک ، بەڵام کاری نەکردە بوو، هەمووی دڕکێکی هێند تیژ بە پەلکەکانیەوە بوو کە نەتدەتوانی دەستی بۆ بەری، ئەمە سەرەڕای ئەوەی دەوەنەکە تەڕ بوو، زۆر هەوڵمان دا، هەمووجارێکیش پەنجەمان دڕکی پێدادەچوون، بەڵا ئێمە لە هەوڵی خۆمان نەدەکەوتین.

نازانم چەندمان پێچوو تا توانیمان یەکێک لەو دەوەنە گوێنیانە ببڕین و بۆ لای چادرەکەمان کێشی بکەین.

زۆر بە خۆشحاڵییەوە وەک سەرکەوتنێکی گەورەمان ، لەو شەوە

ساردەدا، بە دەستهێنانی دەوەنەکەمان بردە ژێر چادرەکە.

هەموو خۆشحاڵ بوون بەوکارەو دەستخۆشییان لێکردین کە توانیمان هەر نەبێ شتێک پەیدا بکەین و شەو لە سەرما رەق نەبینەوە.

بە چەرخەکەی یا شێخ خەریک بووین، بەڵام ئەو دەوەنە لەعنەتییە بە هیچ شێوەیەک ئاگری نەدەکردەوە و گڕی نەدەگرت. ئێمە لە هەوڵی خۆمان بەردەوام بووین کە شێخ سدیق وتی:

_ نەموت ئەمکارە سەختەو ئەمجۆرە دەوەنە زەحمەتە ئاگر بگرێ.

ئەی چارمان چی بوو، خۆ نەدەکرا تا رۆژ دەبۆوە چۆقەچۆقی ددانمان بێت و لەبەر سەرما هەڵبلەرزێین. دەبوو لە هەوڵی خۆمان بەردەوام بین. چ رووەکێکی عەجیب بوو، بە هیچ شێوەیەک ئاگری نەدەگرت، جا هی تەڕبوونی بەفرەکە بوو، یان هەر خۆی لە ناخیدا تەڕو بڕ بوو، بۆیە نەدەسووتا.

شێخ سدیق کە زانی ئێمە هەر سوورین لە سەر کارەکەمان و کۆڵ نادەین وتی:

_ مادام وایە، جارێ پەلە مەکەن، با بزانین لە ژێر چادرەکەدا تۆزێ وشک ببێتەوەو ئینجا هەوڵێکی تری لەگەڵدا بدەن، ئەگەرچی دەزانم سەرکەوتوو نابن.

شێخ خاوەن ئەزموون بوو، ئەو لە دەشت و کێو ژیا بوو، ئەو راستییانەی دەزانی، بەڵام لە بەر ئێمە زۆر لە سەری نەرۆیشت و تەنها وتی:

_ شەو درێژە بەشکو ئەم گوێنییە تۆزێ وشک ببێتەوە.

من لای خۆمەوە گەیشتبوومە ئەو رایەی کە مەحاڵە، ئەمجۆرە دەوەنە بسووتێنرێ، بەڵام راکەی شێخیشم لا پەسەند بوو کە چاوەڕێ بکەین.

مامۆستا عەزیز لەکار نەکەوت هەر بە چەرخەکەی شێخ ، خەریک بوو، لەگەڵیشیدا فووی دەکرد. نازانم چەند بوو خەریکی بوو کە جاروبار کڵپەیەکی دەکرد و بۆ ساتێکی کورت ئاگری دەگرت. بەڵام یەکسەر دەبوو بە دووکەڵ، دووکەڵێک کە تەحەمول نەدەکرا.

ئەو هەر خەریک بوو، لە دووکەڵ زیاتریش هیچی تر پەیدا نەدەبوو، هەموو خەریک بوو بخنکێین بۆیە بە ناچاری چادرەکەمان لادا. یەکێک لە پێشمەرگەکان وتی:

ـــ رەق ببینەوە باشترە لەوەی بخنکێین.

هیچ جیاوازییەک نەبوو، بۆیە هەموو گەیشتینە ئەو قەناعەتەی کە ئەو گوێنییە تورێ بدەین و هەموو بچینەوە ژێر چادرەکەو چاوەڕوانی رۆژ بوونەوە بکەین. بۆیە چادرەکەمان دا بەسەر خۆماندا و بێ ورتە لەو تاریکییەدا بۆی دانیشتین. دەبوو هەر زوو قەناعەتمان بە دەوەن ناسی یا شێخ بکردایە. بۆ نەمان کرد؟

***

## ٢٠

چ شەوێکی بێ کۆتایی بوو، هەر ڕۆژ نەدەهات. هەموو لە سەرماندا هەڵدەلەرزین و خەویش تینی بۆ هێنابووین، بەڵام کەسمان نەماندەتوانی بنووین. زەوی ژێرمان تەڕ بوو، ژێر چادرەکەش بوو بوو بە ئاو. ویستم برێک پاڵ بکەوم، بەڵام بە هیچ جۆرێک بۆم نەدەرەخسا. ناچار تا ڕۆژ بووەوە هەر وەنەوزم دەدا. ئەوانیش هەروەک من وا بوون.

کەسمان لە سەرما قسەمان پێ نەما بوو، هەموو چاوەڕێی ڕووناک بوونەوە بووین.

ئای لە درێژی شەو، کاتێک چاوەڕێی ڕۆژبوونەوە دەکەیت، ئەو شەوە هەر کۆتایی نەدەهات، بۆیە بە سەبرو ناچارییەوە لە چاوەڕوانی ڕۆژبوونەوەدا بووین.

لە بۆڵەبۆڵی پێشمەرگەکان بە ئاگا هاتمەوە، لەوە دەچوو وەنەوزێکم دابێت کە لکی چادرەکەم لادا، دەوروبەر ڕووناک ببووەوە، بەڵام بەفر هەر دەباری.

شێخ سدیق بە دەنگی بەرز ئاگاداری کردین و وتی:

_ کوڕینە با بکەوینە ڕێ، بەم بەفرە، خوا دەزانێ کەی دەگەینە ئاوەدانی.

ئاوەدانی مەبەستی بارەگای دووەم بوو کە دەهاتە ڕێگەمان. شێخ سدیق پێش ئەوەی بڕۆین، جارێکی تر لە ناو شەڵتەی وڵاخەکەیدا بڕێ نانە ڕەقەی بۆ دەرهێناین و بە سەرماندا دابەشی کرد. برسێتی و سەرمای شەو کاری کردبووە سەر جەستەمان، پێویستمان بە وزەیەکی باش بوو، بەڵام لە نانە ڕەقە زیاتر نەبوو، بۆیە بە تامەزرۆییەوە هەریەکەمان بەشی خۆی وەرگرت و هەر بە ڕێگەوە کەوتینە کرماندنی.

کەس نارەزایی نیشان نەدا، هەر چەندە، تا دەڕۆیشتین، هەر چۆڵەوانی بوو، بەڵام ئێمە گوێمان نەدایە و بەردەوامبووین لە سەر ڕۆیشتنمان. مامۆستا عەزیز لە ڕێگە لێم نزیک کەوتەوەو بە ئەسپایی پێی وتم:

_ بە مەزندەی تۆ زۆرمان ماوە بۆ ئاوەدانی؟

منیش هیچ شارەزاییەکم لەو ناوچە دوورەدەستەدا نەبوو، هەموو جگە لە شێخ سدیق کە ڕۆڵی دەلیلی بۆ دەبینین، کەسمان هیچ زانیارییەکمان سەبارەت بە ناوچەکە لا نەبوو.

بۆیە لە وەڵامدا وتم:

_ خوا دەزانێ.

دیار بوو وەڵامەکەی بە دڵ نەبوو چونکە وتی:

_ ئەی تۆ چی دەزانی؟

دەمزانی هیلاکی و سەرماو برسێتی کاری لە هەموومان کردبوو، بۆیە

زۆر بە هێمنی پێم وت:

ـــ لەم وڵاتەی ئێمە، نێوان شوێنەکان، بە کاتژمێر حساب ناکرێ. دەبێ بڵێی چەند دۆڵی ترمان ماوە یان چەند شاخ و گردی تر ....

دیار بوو بەو وەڵامە ئاسوودە بوو، چونکە ئیتر لە سەری نەڕۆیشت. لای نیوەڕۆ تۆزێ بەفرەکە کەمی کرد، بەڵام هەر بەردەوام بوو ، هیچ جێگەیەکی حەوانەوەمان نەهاتە رێ تا پشوویەکی تێدا بدەین. ئێمە بە نێوان دوو شاخی یەکجار بەرزدا رێمان دەکرد، بە کەنار چەمێکدا کە سەرەوخوار دەڕۆیشت و وەک شێخ سدیق باسی دەکرد، ئەم چەمە لە کۆتاییدا روو لە ئێران دەکات.

دەمەو عەسر گەیشتینە شوێنێک کە ئیدی چەمەکە دەبوو بە تاڤگە و تێپەڕبوون پێیدا مەحاڵ بوو. هەموو بە سەرسوڕماوی سەیری یەکدیمان دەکردو بە چاوی سەرزەنشتەوە دەمانڕوانییە شێخ سدیق.

ئەویش تەواو شڵەژابوو، لەوە دەچوو چاوەڕێی شتێکی وای نەکردبێ، بۆیە ئەویش وەک ئێمە سەرسوڕمانی خۆی نیشاندابن، لەگەڵ ئەوەشدا وتی:

ـــ دەبوو پێش ئەوەی بگەینە ئەم تاڤگەیە، بە شاخەکەدا سەربکەوتینایە، چونکە کەس ناتوانێ بەم تاڤگەیەدا بچێتە خوارێ.

لە پرسیاری ئەوەی کە بۆچی زووتر لای نەدا و رێگەی راستمان پیشان بدات ، رێک و رەوان وتی:

ـــ بۆ کەستان هیچ رێگەیەکتان دیت؟

راستی دەکرد، بەفر هەموو شوێنێکی داپۆشی بوو، کەسیش لە ئێمە

هیچ ڕێگەیەکی بەدی نەکردبوو، بۆیە نەمانتوانی گلەیی زیاتر بکەین.

هەموو دەستەوەستان نزیک تاڤگەکە دانیشتبووین. مامۆستا عەزیز هاتە لامەوەو وتی:

ـ چیمان بە سەر دێ؟

بەو پێیەی هیچ ڕێگەیەک نەبوو، نەشماندەتوانی بگەڕێینەوە چونکە وا بۆ دوو ڕۆژ دەچوو بە ڕێگەوە بووین، ئەمەش هەر ئەوەی دەگەیاند، گەر بگەڕاینایەتەوە، ئەوا دەبوو دوو شەوی تر لەو شاخ و کێوە و لە ژێر بەفردا، کات بەسەر بەرین کە تەواو بۆسەر گیانمان مەترسیدار دەبوو.

هەموو لە تاوتوێی ئەوەدا بووین کە چی بکەین. کەسمان چارەسەرێکی ئەوتۆمان پێنەبوو کە دڵخۆشکەر بێت.

هەموو لەو ڕاستییە گەیشتبووین گەر لەو جێگەیە بمێنینەوە ئەوا مەترسییەکی گەورە بۆ سەر ژیانمان پەیدا دەبێت و لە باشترین حاڵەتدا هەموو ڕەق دەبووینەوە.

یەکێک لە پێشمەرگەکان بەشاخەکەدا سەرکەوت، لای ئێمە هەوڵێکی بێ هودە بوو، هیچ ڕێگایەک نەدەبینرا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کەسمان ڕێگریمان لێ نەکرد. ئێمە هەموو پێکەوە سەیری ئەو تاڤگە بە خوڕەمان دەکرد و هەرچەند سەیرمان دەکرد تێپەڕبوون بەو سەرەوخوارییەدا مەحاڵ بوو.

هەموو، بە بێ هیواییەوە، لە یەکدیمان دەڕوانی. مامۆستا عەزیز باسی خۆی و هاوسەرگیری خۆی بۆ دەکردین کە تەنها چەند مانگێک لەوەوپێش زەماوەندی کردووە. من هەستم لای زیندان بوو، بەراوردی

ئەوەم دەکرد کە هەرچەند مانگێک لەوەوپێش فەرمانی لەسێدارەدانم لە بەندیخانەی کەرکووک بۆ دەرچوو بوو ، دەربازبوونم لەو زیندانە لە موعجیزە دەچوو ، کەچی وا جارێکی تر رووبەڕووی مەرگ دەبمەوە. من لەو خەیاڵەدا بووم کە پێشمەرگەکە پڕ بە گەرووی هاواری کرد و وتی:

ـــ رێگەم دۆزییەوە. سەرکەون.

لە راستیدا وەک خەو وا بوو، بۆیە هەر بە پەلە، هەموو رووەو هاوارەکە رۆیشتین. خۆشحاڵیمان ئەندازەی نەبوو.

***

## ٢١

له راستیدا هەواڵێکی یەکجار خۆش بوو، بگره پەرجوویەک بوو بۆ خۆی، بۆیه هەموو هەر خێرا بەرەو دەنگه که چووین، بەڵام تا نەگەیشتینه نزیک هاوەڵەکەمان زۆر دڵنیا نەبووین. که شێخ سدیق له ڕێگەکەی به وردی نواڕی، سەری ڕەزامەندی بۆ لەقاند. له پرسیاری ئەوەی ئایا ئەمه ڕێگەیه و دەربازمان دەکات وتی:

_ بەڵێ ڕێگەیه.

ئەمەی وت و وڵاخەکەی پێش خۆی دا و ئێمەش دوای کەوتین. ڕێگەکه تەنگەڕێیەک بوو که تەنها یەک کەس دەیتوانی پێیدا بڕوا، بۆیه هەموو له پشت شێخەوه ڕێچکەمان بەست. من له پشتیەوه دەڕۆیشتم، لەوێوه جاروبار، سەیری خوارەوەی خۆم، دەکرد، تا دەهات بەرز دەبووینەوه. دیمەنەکەشی ترسناکتر دەبوو، چونکه هەموو ترازانێک کەوتنه خوارەوەی له پشتەوه بوو که هیوای رزگاری له دواوه نەبوو. من هەر بۆ دڵنیا بوون جارێکی تر له شێخم پرسییەوه که بڕوای وایه ئەمه ڕێگه بێت ، چونکه زۆر سەخت و تەنگەبەر بوو له وەڵامدا بێ سەبرانه وتی:

_ بەڵێ .... بەڵێ

لە پرسیاری ئەوەی کە بۆ خۆی پێش وڵاخەکەی ناکەوێ و جڵەوی بگرێ، چونکە زۆر بە هێمنی رێی دەکرد وتی:

_ وڵاخ شارەزایی رێگەی زیاترە، ئەوان بۆنی زەوی دەکەن و بە بۆن دەزانن رێگەیە یان نا.

ئەو پێشمەرگەیەی کە هاواری رێگە دۆزینەوەی لێکردین، لە پشت منەوە دەڕۆیشت، دیار بوو گوێی لە وتووێژەکانمان بوو بۆیە ئەویش هەر لە شوێن خۆیەوە وەک روونکردنەوەیەک بۆ من وتی:

_ هاوڕێ، من تەرسی وشکەوەبووی وڵاخم لە نەوایەکی سەر رێگە دی، بۆیە هاوارم بۆ کردن.

ئەوەی بە دەنگی بەرز وت بەڕادەیەک کە شێخ سدیق بە ئاسانی گوێی لێ بوو، چونکە یەکسەر وتی:

_منیش ئەو پاشەڕۆکەم بە دی کرد.

ئیدی هەموو دڵنیا بووین کە ئەوە رێگەیە ، بۆیە هەموو بێدەنگیمان لێکرد و ورد ورد لە پشت وڵاخەکەوە رەوتمان دەکرد. جاروبار وڵاخەکە برێک دەوەستا ، دیار بوو بۆ رێگەکە دەگەڕا کە تا دەهات بەفر زیاتر دایدەپۆشی، بەڵام هەر خێرا ملی رێگەی دەگرتەوە.

هێشتا تاریک دانەهاتبوو، پروشەی بەفریش هەر بەردەوام بوو ، کە وڵاخەکە گەیشتە کەلێنێک کە لە پشتیەوە بەرەوخوار دادەگەڕا. وڵاخەکە برێک وەستاو شێخ سدیق بەدەنگێکی نزم وتی:

_ کەس پەلە نەکات، با وڵاخەکە بە سەبری خۆی بڕوات. گەر توانی بچێتە ئەو دیو، ئەوا مانای وایە دەرباز دەبین.

هەرواش دەرچوو، چونکە پاش تۆزێک، وڵاخەکە ئەو دیو کەوت و ئێمەش یەکە یەکە بە دوویدا ئاودیو بووین. چ خۆشحاڵییەک سەرو پۆتەلاکی گرتین، لەم دیوەوە ڕێگەکە هێندە بەفر نەیگرتبوو، هەرچەندە زۆریش لە بەرزیدا بووین، بەڵام بن دۆڵەکەمان بە ئاسانی دەبینی. دیمەنەکانی ئەم دیو گەلێک جیاواز بوون دەتوت ئەمە شاخێکی ترە. سەوزاییەکی کەم بە لاپاڵی شاخەکەوە دەبینرا و هەندێ گچکە درەختیش بە قەدپاڵی شاخەکەوە دیار بوون. دیمەنەکە مژدەی نزیکبوونەوەی ئاوەدانی رادەگەیاند. لە خۆشی ئەو قوتاربوونە و رزگار بوونمان لە رەقبوونەوەیەکی مسۆگەر، دەستمان کرد بە تەقەی خۆشی کە وڵاخەکەی شێخ لە ترسا هەڵبەزییەوە و پەلی ترازاو یەکسەر لەو شاخە بەرزەوە کەوتە خوارێ و تا بنی دۆڵەکە خۆی پێ ڕانەگیرا. بەراستی هەڵەیەکی گەورەمان کرد کە بووە مایەی فەوتانی ئەو وڵاخە بەستەزمانە کە چەند ساتێک لەوەوپێش ئەو ببووە مایەی دەربازبوونمان.

شێخ سدیق ئاوڕێکی سەرزەنشت ئامێزی لێداینەوەو بە داخ و پەژارەیەکی زۆرەوە وتی:

_ ماڵتان بە قوڕ بگیرێ بۆ خۆتان و کارتان.

هەموو هەستمان بە شەرمەزاری دەکرد. کەسمان قسەیەکی ئارامبەخشمان پێ نەبوو، کە بەرامبەر شێخ بیکەین و داوای لێبوردنیش بە کەڵکی هیچ نەدەهات. من هەر بۆ دڵدانەوەی یا شێخ وتم:

_ تۆ بڵێی بە ساغی بتوانێ بمێنێ؟

هیچ وەڵامی نەدایەوە، خۆشم دەمزانی پرسیارێکی زۆر سادەو ساکارم کردووە، بەڵام لەراستیدا هەر بۆ راگرتنی دڵی ئەو بوو، دەنا خۆشم دەمزانی لەو بەرزاییەوە کەوتنە خوارەوە بە هیچ جۆرێک هیوای زیندووبوونی لێ بەدیناکرێ. کەوتینەوە رێ ئەو شادی و خۆشییەی لەمەوپێش دەرمانبڕی بووە بێدەنگییەک کە بۆنی ماتەمینی لێدەهات.

ئێمە وردە وردە دادەگەڕاین بە شاخەکەدا کە شێخ کەوتەوە ئاخاوتن وەک ئامۆژگارییەک وتی:

_ وڵاخەکە بە قوربانی ئێوە بێت. ئێوە لە داگەڕاندا ئاگاداری خۆتان بن.

ترسی کەوتنە خوارەوە هەموومانی داگرتبوو، بۆیە هەموو هەنگاومان زۆر بە حەزەرەوە دەنا. کاتێک گەیشتینە نێو دۆڵەکە تاریک داهاتبوو، دەوروبەریش بۆنی ئاوەدانی لێدەهات.

هەموو گورج کەوتینەوە رێ. ئەمجارەیان بە گوڕ و تینێکی ترەوە نازانم چەندی تر بەرێوە بووین کە لە دوورەوە تروسکاییەک بەدی دەکرا . شێخ برێک وەستا، ئیشارەتی بۆ رۆشناییەکە کرد و بە دەنگی بەرز وتی:

_ ئەویش بارەگای پێشمەرگە.

مرۆڤ نابێت هەرگیز بێ هیوا بێت.

***

## ٢٢

خۆشحاڵی بە سەرو پۆتەڵاکی هەموومانەوە، جگە لە شێخ سدیق، دیار بوو، ئەو هێشتا خەفەتی لە دەستدانی وڵاخەکەی لە کەڵلەدا بوو، ناهەقی نەبوو.

بە هۆی بێ ئەزموونی ئێمە وڵاخەکەی لەدەستدا. لەگەڵ ئەوەشدا هیچ لەسەری نەڕۆیشت و گلەیی لێ نەکردین. ئێمەش ئیدی خۆمان لێ کەڕ کرد.

لەدوورەوە ترووسکاییەک بەدی کرا. تا زیاتر نزیک دەکەوتینەوە، جموجۆڵ باشتر هەستی پێدەکرا. مامۆستا عەزیز هاتە تەنیشتمەوە، زەوق و خۆشی لێدەباری وتی:

ــ ئەمشەو تێر دەخۆین و باشیش دەخەوین.

بێگومان. من هەر ئەوندەم وت ، من بیرم لە باقیاتی رێگاکە دەکردەوە، چونکە وەک شێخ سدیق پێی راگەیاندبووین، ئەم بارەگای پێشمەرگەیە نیوەی رێگایە. دەبوو چەند سەختی تر بێتە رێگەمان، تا دەگەیشتینە سێگۆشەی سنوور. بۆ ئێمە هیچ شتێک روون و ئاشکرا نەبوو. کاتێ گەیشتینە بارەگای پێشمەرگە، هەموو بە پیرمانەوە هاتن و باوەشیان

پێدا کردین، دیار بوو هەواڵیان لا بوو کە ئێمە بە ڕێگەوەین، چونکە پێش ئێمە حاجی مەحموود و پێشمەرگەکانی تر گەیشتبوون.

ئەوەی لە سەرەتادا سەرنجی ڕاکێشام، هیچ خانوویەکم نەدی، تەنها چادر بوو لەملاو لەولا هەڵدرابوون. دیار بوو ئەوانیش دەمێک نەبوو، هاتبوونە ئەو ناوە، چونکە هێشتا فریای خانوو دروستکردن نەکەوتبوون.

بە هەرحاڵ بۆ ئێمە چادرێکی گەرم و شیوێکی ئامادە ئەوپەڕی داوامان بوو. خواردنەکەیان نیسکێنە بوو. ئای بە چ تامەزرۆییەکەوە نانمان تێدەگوشی و دەمانخوارد. لە راستیدا ئێمەش زۆر شەکەت و هیلاک و بێهێز بووین، ئەمە سەرەڕای برسێتیمان کە برستی لێ بڕیبووین. لەو دوو رۆژەی پێشوو، تەنها نانی وشکمان بە بەفرەوە خواردبوو ، بۆیە ئەو شیوی درەنگ ئێوارەیە بۆ ئێمە بێ وێنە بوو.

نێو چادرەکان رووناک بوو، لە هەموو چادرێکدا چرایەک دەسووتا و دەوروبەری رووناک دەکردەوە.

پاش یەکتر ناسین لەگەڵ پێشمەرگەکاندا و پرسیاری ئەوەی بۆ لەم سەرمایەدا لە شاخی قەندیل و لە ژێر چادردا دەژین، وتیان ئەوانیش تازە هاتوون و هەمووشیان پێشمەرگە نین، بەڵکو خەڵکی گوندەکانی عەشیرەتی ئاکۆن کە رژیم لە گوندەکانیان دەری پەڕاندوون. ئەوەی کە سەرنجی ئێمەی زیاتر راکێشا کوڕە ئاغایەکی عەشیرەتی ئاکۆ بوو کە ئەویش پەیوەندی بە شۆڕشەوە کردبوو، هەر بۆیەش خەڵکی دێکانی ئەوانیش بە ژن و منداڵەوە دوای کەوتبوون. بەراستی بۆ ژن و منداڵ و پیر، ژیانێکی یەکجار سەخت و دژوار بوو. بۆ پێشمەرگە هەر چۆنێک بوو دەگوزەرا، بەڵام بۆ ژن و منداڵ و لە نێو ئەو بەستەڵەکەدا، کارێکی یەکجار زەحمەت دەبوو. لەگەڵ مامۆستا عەزیزدا بۆ نووستن ناردیانین بۆ نێو چادرێکی تر و لەوێ دوو هەڤاڵمان بەدی کرد کە خۆیان وەک

نامەبەر پێشکەش کردین. ئەوان نامەیان لە سەرکردایەتییەوە بۆ ئاغا هێنا بوو. یەکێک لە پێشمەرگەکان خۆی وەکوو (خەسرەو) ناساند، خەڵکی دەورووبەری خانەقین بوو، لاوێکی خوێن گەرم و زیرەک و چابووک دەهاتە پێش چاو، باسی ئەوەی بۆ کردین کە لە لایەن سکرتێرەوە، نامەیەکی هێناوە، بۆ بایز ئاغای سەرۆکی عەشیرەتی ئاکۆ.

خەسرەو باسی رێگەو بانی بۆ کردین و هەندێ زانیاری بە سوودی سەبارەت بە دوور و نزیکی رێگەکە بۆ باسکردین. بە پێی وتەکانی، دەبوو تا دوو سێ رۆژی تر بە رێدا برۆین، تا دەگەینە سێگۆشەی سنوور. وەک ئەو وتی دەبوو بەیانی زوو بەرێبکەوین. بۆ ئێمە زۆر مایەی خۆشحاڵی بوو، کە کەسێکی شارەزا لەگەڵماندا بێ و رێنماییمان بکات، چونکە زانیارییەکانی شێخ سدیق سەبارەت بە رێگاکە زۆر ورد نەبوون.

ئەو شەوە حاجی مەحموود هاتە لامان و من زۆرم گلەیی لێکرد سەبارەت بە جێهێشتنی ئێمە. ئێمە زۆر شارەزا نەبووین و دەلیلەکەشمان کە یاشێخ بوو، ئەوەندە بەڵەد نەبوو وەک خۆی بانگەشەی بۆ دەکرد. حاجی مەحموود بەڵێنی دا، ئیدی لەرێگەدا بەجێمان نەهێڵێ.

ئەو شەوە لەلای خەسرەو نووستین و تا درەنگانی شەو خەریکی وتووێژ بووین، ئەگەرچی من و مامۆستا عەزیز زۆر هیلاکیش بووین، بەڵام قسەکانی خەسرەومان زۆر پێخۆش بوو. کۆمەڵێک زانیاری وردی لابوو. وەک بۆم دەرکەوت حەزی لە شیعرو ئەدەب دەکرد، چونکە دەفتەرێکی لە خورجەکەی دەرهێناو هەندێ نووسین و شێعری فارسی تەرجومە کردبوو ، وەک خۆی دەیوت چەند ساڵێک دوای هەرەسی شۆرش ژیانی لە ئێران بردۆتە سەر و فارسییەکی زۆر چاک فێر بووبوو کە دەیتوانی تەرجومەی ئەدەبیاتی فارسی پێبکات. بەیانی هەر بۆ بەرچایی نسکێنەی گەرم بوو کە بۆ ئێمە شوێنی گلەیی نەبوو. حەزم

دەکرد لەو فرسەتەدا ئاغای عەشیرەت ببینم، بەڵام بۆم نەڕەخسا، چونکە کە ئێمە کەوتینە ڕێ، ئاغا هێشتا بەخەبەر نەهاتبوو. لەگەڵ پێشمەرگەکانی حاجی مەحموود هەموو یەکمان گرتەوەو کەوتینە ڕێ. چەند کاتژمێرێک بە ڕێگەوە بووین کە تووشی چەند پێشمەرگەیەکی تر بووین کە ئەوانیش لە سێگۆشەی سنوورەوە بەرەو سلێمانی و ناوچەی خۆمان دەگەڕانەوە. هەندێکم لێناسین و ئەوانیش هەندێک باسی ڕێگەیان بۆ کردین و سەرسوڕمانی خۆیان نیشاندا کە بەو زستانە ئێمە تازە بەرەو سنوور بە ڕێدەکەوین. لە ڕاستیدا ئەوان زۆر باسی سەختی و دژواریی ڕێگەیان بۆ کردین و وایان نیشاندا کە ئەوەی تا ئێستا بڕیومانە هەر هیچ نەبووە لەچاو ئەوەی دێتە پێشمان. بەهەرحاڵ ئێمە تازە بڕیارمان دابوو، نەدەکرا پەشیمان ببینەوەو دوودڵیش بە دەردی کەسی نەدەخوارد.

ئەمجارە ژمارەمان لە سی پێشمەرگە تێدەپەڕی و بە پێی ئەو بەڵێنەی حاجی مەحموود پێیدابووین، هەموو پێکەوە بووین و لە یەکدی نەدەپچڕاین. هیچ گوندێک یان ئاوەدانییەک نەدەهاتە ڕێگەمان. هەمووی هەر شاخ و داخ و نشێو و هەوراز و هەڵەت بوو. بەفریش سەر شاخەکانی تەنیبوو. لە پرسیاری ئەوەی کە ئێمە ئێستا بەرەو کوێ دەڕۆین، خەسرەو ئیشارەتی لای ڕاستی خۆی دا و وتی:

_ ئەو دیو ئەو شاخە شاری (خانە)یە، کە ئێرانییەکان پێی دەڵێن پیرانشار.



## ٢٣

من ساڵی ١٩٧٤ شاری «خانە»م دیبوو، بەڵام ئەوکاتە لە حاجی ئۆمەرانەوە بە ئۆتۆمبێل دەچووین و بە لاڕێدا نەدەڕۆیشتین، بۆیە یەکجار وا سەخت نەبوو بۆمان. بەڵام ئێستا و بەم زستانە و بە نێو قەندیل دا، کارێکی زۆر تاقەت پڕووکێن بوو. خۆم لە خەسرەو نزیک کردەوە، دەمویست هەندێ پرسیاری سەبارەت بە ڕێگەکە لێ بکەم، هەرچەند ئەو شەوی پێشوو زۆر باسی بۆ کردبووین، بەڵام من هەر بۆ دروستکردنی دەمەتەقێیەک و بزواندنی وتم:

_ ئەمڕۆ دەگەینە شاری خانە؟

لە وەڵامدا وتی:

_ بڕوا ناکەم، زۆرمان ماوە، بەڵام هەر ئەم شاخە ببڕین، لەو دیو پشوو دەدەین.

لەبەر ئەوەی بەرەو ئاوەدانی ملمان دەنا، هەموو زۆر چالاکانە دەڕۆیشتین. سەرنجم دایە پێش خۆم، حاجی و پێشمەرگەکانی هەنگاوی گورج و پتەویان دەنا . ئەوان زۆر لە ئێمە باشتر ڕەوتیان دەکرد. هەر بۆ کردنەوەی بابەتێک لەگەڵ خەسرەو پرسیاری ئەوەم لێکرد کە چۆن ڕێی کەوتۆتە ئێران و لەوێ بۆ بووە بە پەنابەر؟

لە وەڵامدا وتی:

_ دوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلوول، من نەگەڕامەوە بۆ عێراق و پەنابەریم لە ئێران هەڵبژارد.

کەمێک وەستا، دیار بوو دەیویست ڕووداوەکان بهێنێتەوە یاد خۆی، چونکە پاش تۆزێک وتی:

_ کارەساتێکی ناخۆش بوو، من هەرگیز بڕوام نەدەکرد بەو دەردە بچین و شۆڕش ئاوا لە ناکاودا تێک بچێ و ئێمەش ناچاری دەربەدەری بین.

منیش خۆم بەشدار بووم لە شۆڕشدا، بەڵام پێش نسکۆکە، بۆ خوێندن چووبووم بۆ وڵاتی ئەڵمانیا، بەڵام بە گەیشتنی من کارەساتەکە قەوما، بۆیە منیش وازم لە خوێندن هێناو گەڕامەوە وڵات. ئەمانەم هەموو بۆ خەسرەو باس کرد. زۆر بە بایەخەوە گوێی بۆ شل کردبووم، لە گەڕانەوەشم سەری سوڕمابوو، بەڵام من پاساوی گەڕانەوەم بۆ شیکردەوە کە نەمدەتوانی دوای ئەو لێقەومانە دوورە وڵات بم. بۆ من هەرەس خەونێکی یەکجار ناخۆش بوو، بەڵام ئیدی دەسەڵات چی بوو.

من زۆر بەوە خۆشحاڵ بووم، کە زۆر بە زوویی، خەبات و بەرخۆدان دەستیپێکردەوە و نەمانهێشت دوژمن لەزەت، لەو بەحیساب سەرکەوتنە، وەرگرێت.

خەسرەو باسی ژیانی نێو ئێرانی بۆ کردم کە چۆن بە ڕەزالەت لەو شارانە ژیاون و لە شارە دوورەدەستەکانی ئێراندا جێگیر کراون و هەموو ناچاری کاری جەستەیی سەخت کراون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر بە ئاواتی ڕۆژێکی وەکوو ئەمڕۆ بوون کە دەست بدەنەوە چەک و بەشداری خەباتی چەکداری بکەن.

خەسرەو لە جووڵەیەکی نائاساییدا ، کلاشینکۆفە یەک لاقییەکەی لە

شان کردەوەو دەستی کرد بە ماچ کردنی، دەتوت لە ژوانداپە لەگەڵ خۆشەویستەکەی. خەسرەو وتی:

_ ئای چەند تامەزرۆی ئەوە بووم رۆژێک ئەم چەکە بکەمەوە شانم. ئێستا تەواو ئاسوودەم کە چەک بە شانی خۆمەوە دەبینم.

قسەکای زۆر شاعیرانە بوو، هەستی وەک مرۆڤێکی بە هەست و سۆز دەردەبڕی. دیار بوو سوودی لە فێربوونی زمانی فارسیش باش وەرگرتبوو، چونکە جاروبار شێعرێک، یان بەیتێکی فارسی بۆ شیدەکردمەوە کە بۆ من مایەی سەرنج و بایەخدان بوو. ئەو بە دەم رۆیشتنەوە باسی چیرۆکەکانی (سەمەدی بێهرەنگی) بۆ دەکردم و ئاماژەی بەوەشدا کە هەندێک لە چیرۆکە کورتەکانی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی.

خەسرەو ئیشارەتی بە کۆڵەپشتییەکەی دا و وتی:

_هەندێ لەو چیرۆکانەم وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی ، دەتوانی لە فرسەتێکدا بیانخوێنیتەوە.

منیش خۆشحاڵی خۆم نیشان دا، بە تایبەتی کە ماوەیەکی زۆر بوو بە هۆی ژیانی پێشمەرگایەتی و پارتیزانییەوە ئەو مۆڵەتەم بۆ نەدەرەخسا کە کتێب بخوێنمەوە بۆیە وتم:

_ بە خۆشحاڵییەوە، هەر مەجالێک برەخسێ، دەیان خوێنمەوە.

خەسرەو کەوتە باسی ژیانی خۆی کە چۆن رۆژانە لە شارەکانی رۆژهەلاتی ئێراندا کرێکاری کردووە، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا فرسەتی ئەوەی پەیدا کردووە کە خۆی فێری زمانی فارسی بکات ، بەرادەیەک کە ئیدی پێویستی بە کەس نەبووە.

لە هاوارێکی حاجی مەحموود بە ئاگا هاتینەوە . داوای دەکرد کە هەموو پێش ئەوەی بە سەر شاخەکەی بەرامبەرماندا سەر بکەوین

پشوویەک بدەین. لە راستیدا پێشنیارێکی بە جێ بوو، هەموو هیلاک بووبووین. لە بەیانییەوە کە بەڕێکەوتبووین ئەوە یەکەم پشوومان بوو. هەموو لە قەدپاڵ شاخەکەدا لێی دانیشتین، ئەوسا بە تەواوی سەرنجی خەسرەوم دا . تەمەنی، دەورووبەری سی ساڵ دەبوو، هەموو جەستەی پارتیزانێکی نموونەیی بەرجەستە دەکرد. لەکەسایەتییە شۆڕشگێڕەکانی ئەمریکای لاتین دەچوو، بە ریشە رەش و سمێڵە قەترانی و قژە پڕەکەی، بە چەکی سەرشان و کۆڵەپشتییەکەی نموونەی پێشمەرگەیەکی شۆڕشی نوێ بوو.

کات پاش نیوەڕۆ بوو، حاجی مەحموود کە پێشمەرگەکانی چەند ولاّخێکیان پێ بوو، هەندێ نانی لە توورەکەیەکدا دەرهێنا و سەرو نانی پێداین. بە راستی لە کاتی خۆیدا بوو، چونکە برسێتی تینی بۆ هێنابووین. لە راستیدا ئێمە کەسمان بیری ئەوەمان نەبوو کە لە بارەگای ئاغا کەوتینە رێ ، نان لەگەڵ خۆمان هەڵبگرین، چونکە واماندەزانی ئاوەدانی دێتە رێگەمان.

حاجی نانێکی دایە دەستم و بە پێکەنینەوە وتی:

_ دیارە ئێوە نانتان نەهێناوە!.

توانجێکی بە جێ بوو کە پێویستی بە وەلاّمدانەوە نەبوو. لێرەشدا بێ ئەزموونی خۆمان نواند.

****

## ٢٤

پشوویەکی باش بوو، بڕێک تین و وزەمان تێگەڕایەوە. حاجی هاتەوە لامان و تۆزێک راوێژی لەگەڵ خەسرەو کرد. ئەگەرچی وەک بۆمان دەرکەوت حاجیش شارەزاییەکی باشی لەو رێگە و بانە هەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا پێویستی بە رێنمایی خەسرەو هەر هەبوو ، چونکە ئەو تازەگی لەو رێگەیەوە هاتبوو.

خەسرەو، لە کاتی دەستنیشان کردنی رێگەکەدا، بە حاجی وت:

_ هەر ئەم رێگەیە هەیە کە تا شاری (خانە) بمانبات، ئیدی رێگەی تر نییە ، بۆیە هیچ نیگەران مەبن و رێگەمان لێ تێکناچێت.

هەواڵێکی خۆش بوو بۆ هەموومان، چونکە ئێمە ئیتر دڵنیا بووین. لە راستیدا خەسرەو شوێنەکە باش شارەزا بوو. حاجی پێشمان کەوت و ئێمەش بەدوایەوە رێچکەمان بەست. لە پرسیاری ئەوەی کە بۆچی خەسرەو خۆی پێشمان ناکەوێت وتی:

_ لەبەر ئەوەی هەر ئەم رێگەیە هەیە و مەجالی ون بوونی تێدا نییە.

بە شاخەکەدا هەڵدەزناین و وردە وردە ڕێگەکە سەختتر دەبوو، بەڵام بە هۆی ئەوەی کە ئیدی بەرەو شوێنێکی دیار دەڕۆیشتین، هەموو خۆشحاڵ بووین.

لە هەورازدا، قسە کردن خۆش نییە، ئەوەم هەر زوو تێبینی کرد کە پێشمەرگە لە کاتی هەڵگەڕاندا بێ دەنگی هەڵدەبژێرێت و کەس ورتە ناکات. تەنها دەنگێک کە دەهاتە بەرگوێ پرمەی ئاژەڵەکان بوو کە تێکەڵ بە شریخەی ناڵی بارگیرەکان دەبوو کە دەخشا لە بەردی ساف و لووسی شاخەکە.

من بیرم هەر بۆ لای ڕێگاکە دەچوو، بیری قسەی پێشمەرگەکانی سەرڕێمان کەوتەوە کە بەرەو ناوچەی سلێمانی دەچوون و دەیانوت هێشتا ڕێگەی سەخت نەهاتۆتە پێشتان. ڕاستیان دەکرد، چونکە تا دەهات شاخەکان بڵندتر و دەشت و دۆڵیش کەمتر دەبینرا.

بۆ من ئەوە یەکەمجار بوو، ئاوا بە بەردەوامی بڕۆم. من وام دانابوو کە دەچمە دەرەوە ئیتر لە بارەگای پێشمەرگە دەحەوێمەوە. بەڵام وادەرنەچوو. ئێمە وەک پێشمەرگە هێشتا ئەوەندە نەبووین کە بتوانین بارەگای سابیت و شوێنی حەوانەوەی هەمیشە دابین بکەین. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە چەکەکانیشمان هەمووی چەکی سووک بوون و بەرگەی هێرشی سەربازی نەدەگرت. ئەوان ، ڕژێم، خاوەنی سوپایەکی گەورەو مەشقپێکراو و پڕچەک بە تازەترین جۆری چەک ، ئەمە سەرەڕای فڕۆکەی جەنگی و هالیکۆپتەر و تۆپی دوورهاوێژ. بۆیە بۆ پاراستنی خۆمان و گێچەڵ دروست نەکردن بۆ دانیشتووانی گوندەکان، جەولە سەلامەتترین چارەسەر بوو. هەرچەندە ئەم گەشتەی ئێمە بۆ سێ گۆشەی سنوور لە پێناو هێنانی چەکدا بوو، کە نەشماندەزانی چ جۆرە چەکێکن ، لەگەڵ ئەوەشدا بۆ ئێمەی پێشمەرگە زۆر هیوا بەخش بوو.

ئێمە لە ڕووی چەکەوە پێویستمان بە هەموو جۆرە چەکێک بوو، بە تایبەتی چەکی دژە ئاسمانی کە زۆر پێویست بوو. ڕژێم بە چەکی ئاسمانی دەیتوانی گەورەترین زەربە لە پێشمەرگە بدات. بۆ سەربازانی ڕژێم زۆر سەخت بوو کە بتوانن لە شاخ و دۆڵ و پەنا پەسیرەکانی کوردستان ڕۆڵی کاریگەریان هەبێت، هەر چەکی ئاسمانی بوو کە کۆڵی پێشمەرگەی دەکوتا، بۆیە هیوای گەورەمان و خەونی هەمیشەییمان دەستکەوتنی چەکی دژە ئاسمان بوو. تۆ بڵێی بە دەستمان بگات؟.

ئەم پرسیارەم هەمیشە لە خۆم دەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا، بیرم لەوە دەکردەوە کە چەکی دژە فڕۆکە ئایا دەتوانرێ بە شان هەڵبگیرێ و بە ئاسانی بگوازرێتەوە!. من هیچم دەربارەی کاری سەربازی تا ئەوکاتە نەدەزانی، چونکە وەک زۆربەی زۆری دانیشتووانی ئەم وڵاتە خزمەتی سەربازیم نەکردبوو ، بۆیە دەبوو هەر هەمووشتێک بە تاقیکردنەوە فێربم و خۆم لە سەریان ڕابهێنم . من ئەوانەم بۆ داهاتوو دانابوو، ئەگەرچی ئەو ئەزموونە کەمەی ساڵی ١٩٧٤ م لە شۆڕشدا هەبوو، بەڵام هێندە نەدەبوو کە وەک سەربازی مەشقپێکراو هەڵسوکەوت بکەم.

کاک ئەنوەر هەر لە سەرەتاوە ئەو ڕاستییانەی لا درکاندم ، چونکە ئەو دەیوت پێشمەرگە پێویستی بەو جۆرە ڕاهێنانە نییە کە سەرباز دەیکات. پێشمەرگە بە ئەزموونی ڕۆژانە و بە کردار فێری بەکارهێنانی جۆرەکانی چەک و چۆنیەتی شەڕ دەبێت. ئەنوەر ڕاستی دەکرد، چونکە زۆربەی ئەوانەی دەبوونە پێشمەرگە هیچ ئەزموونێکی شەڕیان نەبوو. زۆربەیان گەنجی ئاسایی بوون، قوتابی، کاسبکار، دوکاندار و کرێکار و هەندێ جاریش مرۆڤی بەئەزموونی تێدەکەوت کە بەشداربوون لە شۆڕشەکانی پێشوو. بەڵام ئەوانە هەر کەمتر بوون لە بێ ئەزموونەکان. من تا ئەو کاتە تووشی شەڕی بەرەنگاری و ڕووبەڕوو نەبووبووم و نەمدەزانی لە یەکەم شەڕدا چۆن دەبم. بەڵام هەستم هەمیشە لای

ئەوە بوو کە ئێمە داکۆکی لە وڵاتێکی داگیرکراو دەکەین. ئێمە لە سەر حەقین بۆیە لە خۆم دڵنیا بووم کە دەتوانم لە کاتی پێویستدا بە ئەرکی سەر شانم هەڵبستم.

سەرم بەرز کردەوە شاخەکە هێشتا زۆری مابوو، تا سەریش دەکەوتین بەفرەکە خەستتر دەبوو، بەڵام ڕێگەکە خۆشبەختانە شکێندرابوو، بۆیە بۆ ئێمە هێندە سەخت نەبوو ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە ژمارەمان زۆر زیادی کردبوو، بەو پێیەش ڕێگەکە باشتر دەشکێندرا و ئاسانتر دەبوو.

بە ئەسپایی بە خەسرەوم وت:

ـــ چەندمان ماوە بگەین.

هەرچەندە ئەو ڕاستییەش شارەزا بووبووم کە ڕێگەکانی کوردستان بە سەعات ناپێورێ، بەڵکو بە دۆڵ و بە دێ و بە شەوو ڕۆژ دیاری دەکرێ. ئەو وەڵامی نەدایەوە، نازانم گوێی لێ نەبوو یان نەیویست. هەر کامیان بێت ، منیش بێدەنگ بووم و لە سەری نەڕۆیشتم.

***

## ٢٥

ئێمە بەردەوام بە بێدەنگی دەڕۆیشتین کە خەسرەو بە دەنگی بەرز وتی:

_ بە حاجی بڵێن تۆزێ خێراتر بڕوات.

هەریەک بە پێشمەرگەی پێش خۆی دەوت، ئەوە نەریتی گواستنەوەی فەرمان بوو، لە سەرەوە بۆ خوارەوەو بە پێچەوانەشەوە. کە فەرمانەکەت دەگەیاندە ئەوی بەر دەمت، ئەویش راستەوخۆ دەیگەیاندە ئەوەی پێش خۆی.

لەراستیدا نەدەکرا لەوە خێراتر بڕۆین، هەورازەکە تا دەهات قووچتر دەبوو، بۆیە وەک پرسیار بە خەسرەوم وت:

_ بڕوا ناکەم لەوە خێراتر بتوانین بڕۆین.

خەسرەو ئاوڕی لێدامەوە و بڕێک وەستا، وەک پشوویەکی خێرا بدات وتی:

منیش دەزانم، بەڵام مەبەستمە، پێش تاریک بوون، بگەینە ئەو دیو.

مەبەستی لەو دیو، دیوی ئێران بوو ، ئێمە دەبوو تا دەمانتوانی لە

سنووری حاجی ئۆمەران کە تژی بوو لە سەربازگە و ڕەبایا دوور بکەوینەوە.

خەسرەو وتی:

ـ ئەو دیو بەفری کەمترە و دەتوانین لە پەنایەکدا تا ڕۆژ دەبێتەوە بحەوێنەوە. بەڵام گرنگ ئەوەیە پێش تاریک بوون بگەینە ئەو دیو شاخەکە. نابێ شەو لە سەر شاخ بمێنینەوە، دەنا هەموو ڕەق دەبینەوە.

کرۆکی ئەو وتانەیم بۆ پێشمەرگەکانی پێش خۆمان بە دەنگی بەرز ڕوونکردەوە.

دیار بوو هەموو دەمانزانی مانەوە بە شەو لە سەر شاخێکی وا بەرزو لە زستانداو لە ناوچەی قەندیل چەند مەترسیدارە، بۆیە هەموو هەنگاوەکانیان گورجتر کرد و بە هیمەتێکی نوێوە ڕەوتیان دەکرد.

لەکاتی مەترسیدا، هیلاکی ڕۆڵ نابینێ و نە برسێتیش ڕێگر دەبێ، بۆیە هەموو بەو هەستی ترسەوە، وزەی نوێ دەچووە جەستەمان. کەس ناڕەزایی لەو پێشنیارە نەبوو، بۆیە هەموو وەک فەرمانێکی سەربازی پیڕەوی وتەکانی خەسرەویان دەکرد، بە تایبەتی چونکە ئەو تازە بەو ڕێگایەدا هاتبوو، بۆیە کەس پرسیاری هیچی لێنەکرد.

هەر بەو هەستەوە، هەموو بەردەوام بووین، هەنگاوەکانمان خێراتر دەنا و دەمانویست هەرچۆنێک بێت، پێش تاریک بوون، لە مەترسی قوتار بین.

هەرواش بوو، پێش ڕۆژئاوابوون ئێمە بۆ ئەو دیو شاخەکە داگەڕاین. خەسرەو ڕاستی دەکرد تا دەهات بەفرەکە کەمتر دەبوو. ڕووناکی چرای دێکانی سەر سنوور لە دوورەوە دەبینران و ئاهێکی خۆشی دەکرد بە گیانماندا. مامۆستا عەزیز خۆی هێنایەوە نزیکم و خۆشحاڵی

لێدەباریی، وتی:

_ تۆ بڵێی بگەینە دێیەک و ئەمشەو پشوویەکی راستەقینە و نانێکی ئاسایی وەک خەڵکی بخۆین.

مەزندەی دووری ئەو دێیانە نەدەکرا، رووناکی هەندێ جار هەڵخەڵەتێنەرە، بەڵام کە بەرەو پیری دەرۆی هەر پێی ناگەیت، بۆیە نەمتوانی وەڵامێکی ئاسوودە بەخشی بدەمێ و تەنها وتم:

_ منیش هیوادارم.

داگەڕان ئاسانتر بوو، وردە وردەش نزیک تەختایی دەکەوتینەوە.

خەسرەو وتی:

_ وا چاکە لانەدەین، چونکە نازانرێ ئەو دێیانە پاسگای تێدایە، یان نا.

پاسگا وەکو سەربازگەی لای خۆمان بوو، ئێمە گرووپەکەمان کەم نەبوو، بە وڵاخ و چەکدارەوە نەدەکرا وا بە ئاشکرا روو بکەینە نێو دێکانی ئێران ، هەرچەندە گەر بشرۆشتینایە نەدەزانرا کەی دەگەین بەو دێیانە.

خەسرەو زیاتری بۆ روون کردینەوە وتی:

_ وا چاکترە هەر بە قەدپاڵی شاخەکەدا بەرەو خانە بچین، چونکە گەر بچینە نێو دێکان زۆر دوا دەکەوین و ئەو کارەش بۆ ئێمە گەلێک مەترسیدارە.

راستی دەکرد، ئێمە ئێستە وەک دەڵێن بە قاچاخ هاتووینەتە نێو سنووری وڵاتێکی دیکە، ئەگەرچی هەر بەشێکی تری کوردستانە، بەڵام کورد خۆی بەرێوەی نابات و بە کردار ئەویش داگیرکراوە.

هەموو ئەو راستییەمان دەزانی، بۆیە کەس داوای ئەوەی نەکرد کە بەرەو دێکان مل بنێین و هەموو بێ ورتە وەکو خەسرەو پێی وتبووین، بەرەو خانە رێچکەمان بەستەوە.

حاجی مەحموود وەک پێشمەرگەیەکی کارامە و دنیادیدە هەموانی راگرت و بە دەنگی بەرز وتی:

_باشە لە هیچ شوێنێک لا نادەین، ئەی تۆزێک نان نەخۆین.

نانیش مەبەستی هەر نانی وشک بوو، هیچی زیاتری پێ نەبوو، بۆیە هەموو بە پێشنیارەکەی خەنی بووین.

نانی وشکیش لە کاتی برسێتیدا، عەجیب لەزەتێک بە مرۆڤ دەبەخشێ.

حاجی بە کارامەیی خۆی ولاخەکەی راگرت و سەرو نانی بەسەردا دابەش کردین.

هەموو لە جێی خۆمان هەڵترووشکاین و دەستمان کرد بە کرماندنی نان.

ئەوەی باشبوو بەفرەکە ، لەم قەدپاڵە ، بەرەو توانەوە دەچوو، رۆڵی ئاوی بۆ ئێمە دەگێڕا.

***

## ٢٦

پاش پشوویەکی کورت کەوتینەوە ڕەوت، دەوروبەر تەواو تاریک بووبوو، تەنها ڕۆشنایی دێ پەرش و بڵاوەکانی خانە دەبینرا . بە پێی ئەو بڕیارەی کە لە کاتی پشوودا درا، ئەویش لە سەر پێشنیاری خەسرەو بوو کە هەرچۆنێک بێت خۆمان لە جادەی گشتی دوور بگرین و خۆمان لە ڕووداوی ناکاو لابدەین.

بینینی جادەی قیر بۆ ئێمە هەستی بینینەوەی شار و ئاوەدانی لا بزواندین، چونکە ماوەیەکی زۆر بوو توخنی جادەو ڕێی گشتی نەدەکەوتین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەرچی نەشمانتوانی بچینە سەر جادەکە هەر بە بینینی گەشکە دایگرتین.

وەک خەسرەو دەیوت، دەبێ ئەم شەو تا دەتوانین بڕۆین، چونکە بە پێی زانیاری ئەو، بەرەبەیان دەگەیشتینە نزیک «خانە» و ئیدی دەبوو تا تاریک دادێتەوە لەپەنایەکدا خۆمان حەشار بدەین، چونکە بە هیچ شێوەیەک نەدەبوو وا بکەین ئێرانییەکان بە بوونمان لە خاکیاندا بزانن و بەو پێیەش تووشی گێچەڵ و دەردی سەری ببین.

ئێمە تا ڕادەیەک پشوومان دابوو، تۆزێکیش حەسابووینەوەو شتێکمان خواردبوو، هەروەک ڕێگەکە، تا دەچووین، تەختتر و لە بارتر دەبوو،

بۆیە هەموو بە بێ ورتە بە دوای یەکدیدا دەڕۆیشتین.

لە ڕاستیدا کارێکی ترسناکیش بوو، سێ پێشمەرگە بە چەکەوە، بە قاچاخ، بە وڵاتێکی تردا، بە وڵاخەوە، تێپەڕبوونی هەروا کارێکی سانا نەبوو، هەموو ساتێک مەترسی کەشفبوونمان هەبوو، ئیدی پاش ئەوە هەر خودا دەیزانی تووشی چی دەبووین.

وەک خەسرەو بۆی باسکردین، تێپەڕبوون لە ڕێگەی حاجی ئۆمەرانەوە مەحاڵ بوو، چونکە ڕژێم هەموو هێزی خۆی لەو ناوچە سنوورییە لەگەڵ ئێراندا بڵاو کردبووەوەو دەرفەتی پەڕینەوەی بە هیچ جۆرێک نەهێشتبووەوە. بۆیە ئیدی چار هەر ئەوە بوو کە بە نێو خاکی ئێراندا گوزەر بکەین و بە پەلە خۆمان بکەینەوە بە سنووری عێراقدا. من ئەو شێعرەی شاعیری گەورەمان «سالم» م بیر دەکەوتەوە کە دەڵێ :

لەگەڵ دڵ شەرتە سالم گەر نەجاتم بوو لە تارانا

بەهەشت گەر بێتە دەشتی (ڕەی) بە ئێرانا گوزەر ناکەم.

ئەوەی باش بوو لەو شەوە تاریک و نووتەکەدا، ڕێگەمان بەرەو دەشتێکی پانوبەرین دەچوو بۆیە بە ئاسانی دەڕۆیشتین و هەستمان بە شەکەتی نەدەکرد.

لە ڕاستیدا من نەمدەزانی ڕێگەکەمان یەکجار وا دوور دەبێ، ڕەنگە بڕیاردان بۆ گەیشتنە سێ گۆشەی سنوور ئاسان بووبێ، بەڵام بەجێهێنانی وا ئاسان نەبوو. دەبێ هۆکاریش ئەوە بووبێت کە ئێمە هەمیشە لاڕێ و شوێنی دوورەدەستمان دەگرتەبەر، بۆیە ڕێگە وا دوور دەهاتە پێش چاو. ڕۆیشتن بە پێ و لەگەڵ وڵاخداو بە چەکەوە و بە نیگەرانییەوەو لە وڵاتێکی تردا، ڕێگەکەمانی هێندەی تر دوورخستبووەوە. بە هەرحاڵ، هیوای ئەوەی کە بەرەبەیان دەگەینە نزیک شارێک، وزەو تینی نوێی پێ دەبەخشین، بەرادەیەک کە هەستم نەدەکرد کەسێک لە نێوماندا گلەییەکی هەبێت.

ئەوەی باش بوو بۆ ئێمە ، رژێمی ئێران وەک عێراق لە سەر هەموو تەپۆڵکەو گرد و نزیک ئاوەدانییەک، رەبایا و سەربازگەی نەبوو، بۆیە ئێمە یەکجار، وەکو دیوی خۆمان، هێندە بە حەزەرەوە نەدەڕۆیشتین. ئەوەی زۆر سەرنجی راکێشام، لەگەڵ ئەوەشدا کە هەندێک لە پێشمەرگەکان تەمەنیان سەرو پەنجا سالیش دەبوو، بەلام کەسیان سواری ولاخ نەبوون و هەموو وەک ئێمە هەر بە پێ رەوتیان دەکرد.

هیچ ئاوەدانییەک نەهاتە رێگەمان، یان ئەوە بوو کە ئێمە قەدپاڵ شاخەکەمان جێ نەدەهێشت و زۆر لێی دوور نەدەکەوتینەوە یان هەرخۆی ناوچەکە کەم ئاوەدانی بوو.

لە نیوەشەودا، پشوویەکی ترمان دا، بەلام هیچ مۆڵەتی نووستن نەبوو، بۆیە هەر خێرا کەوتینەوە رێ. هەموو هیوامان لەسەر رۆژبوونەوە هەڵچنی بوو کە هەر نەبێ دەگەین بە نانێکی گەرم و پێخۆرێکی راستەقینە، چونکە بەرەو شارێکی تا رادەیەک گەورە دەچووین.

لە برسێتیدا مرۆڤ خەیاڵی هەر بۆ لای خواردن دەچێ، هەر ئەوەش بوو کە مامۆستا عەزیز لێم نزیک کەوتەوە بە ئەسپایی وتی:

_ ئای بۆ خواردنێکی گەرم.

ئەوە هێندەی تر هەستی برسێتی ورووژاندم. بیرم بۆ لای کاکە عەبە دەچوو کە لای خۆمان هەمیشە باسی خواردنی بۆ دەکردین و هەمیشە ئامادەگی خۆی بۆ لێنانی خواردنێکی خۆش و بە لەزەت نیشان دەدایین.

لە وەلامی مامۆستا عەزیزدا وتم:

_ هەموو حەزمان لێیە، بەلام چار؟ با چاوەڕێی سبەی بکەین. هیوادارین هەموو نانێکی باش بخۆین.

ئیتر عەزیز کەوتە باسی خواردن، بەڕادەیەک لە بیری چوو لە

لەشەودا نابێ ، پێویست نەبێ، قسە بکات. ئەم ورتە ورتەی سەرنجی پێشمەرگەکانی راکێشا، بەڵام کەسیان متەقیان لێوە نەدەهات. من دڵنیا بووم کە هەموو حەزیان لەوەبوو باسی خواردن بکرێ، بۆیە هەموو گوێقوڵاخ بوون، لەگەڵ ئەوەشدا، من بە ئاگام هێنایەوە کە نابێ هێند لە سەر ئەو بابەتە بڕوات.

عەزیز وەک پیاوێکی رووخۆش و قسە خۆش و خۆشمەشرەف رەخنەکەمی بە رۆحێکی وەرزشییەوە وەرگرت و لە باتی وتی:

_ ئێ باشە. کە ناتوانین بە پراکتیک، ئێستا ئەم داخوازییە جێبەجێ بکەین، با بە تیۆری پیادەی بکەین ....

دەیویست قسەکانی، وابزانم هەر بۆ خۆشی، بخاتە بەرگێکی سیاسییەوە ، بۆیە تیۆری و پراکتیکی تێکەڵ بە قسەکانی دەکرد.

بۆ کۆتایی هێنان بە وتووێژەکەمان ، کە خەریک بوو ئیدی پێشمەرگەکان سەغڵەت بکات وتم:

_ ئێستا نە بە تیۆری و نە پراکتیک و نە بە دایلەکتیک ، خواردنمان چنگ ناکەوێت. با چاوەڕێی بەیانی بین.

***

## ٢٧

ئەو شەوە تا بەرەبەیان، بێ وچان بەڕێوە بووین. تاریک و روون رۆشناییەکی زۆر لەدوورەوە دەرکەوت، خەسرەو بە ئەسپایی پێی وتم:

ـ ئەو رۆشناییە شاری (خانە)یە.

یەکسەر وتم:

ـ زۆرمان ماوە بگەین؟

نازانم هیلاکی و شەکەتی رێگە بوو یان تین و وەنەوزی خەو بوو کە ئەو پرسیارەی پێکردم. بە هەر حاڵ ئەو تەنها سەری لەقاند، منیش زیاتر لە سەری نەڕۆیشتم.

من وەمزانی وەڵام ناداتەوە کەچی هەر پاش تۆزێک وتی:

ـ تا تەواو رووناک دەبێتەوە، دەبێ بڕۆین.

وەڵامێکی بە جێ و ئاسوودەبەخش و شارەزایانە بوو، بۆیە ئیتر پرسیارم نەکرد.

کە تەواو دەورووبەر رووناک بووەوە، لە دوورەوە شاری خانە بەدی دەکرا. شارێکی گەورە دەهاتە پێش چاو، ماوەیەکی زۆر بوو ئاوەدانی وا گەورەمان نەدی بوو، بۆیە هەموو بە تاسووقەوە تێماندەڕوانی.

سەرنجم بۆ لای چەپم دا، شاخێکی بڵند کە لەوەدەچوو بەردەوامی شاخەکانی پشتی حاجی ئۆمەران بێت بە ئاسانی دەبینرا. ئەویش بەفر سەراپای پۆشیبوو. لای راستمان دەشتێکی پانوبەرین بوو، تا چاو بڕی دەکرد تەختایی بوو.

خەسرەو هەموومانی راگرت و ئیشارەتی بۆ دۆڵێک لە شاخەکەی تەنیشتمان کرد و وتی:

_دەبێ هەموو ئیتر لێرە بارو بنە بخەین، تا ئێوارە تاریک دادێ، چونکە ئیتر ناتوانین بە رۆژ بە نێو خاکی ئێراندا بڕۆین.

کەس تاقەتی پرسیاری نەبوو، وابزانم هەموو چاوەڕێی ئەوە بوون بگەینە جێگەیەک و کەمێ پشوو بدەین، چونکە سەراپای شەوەکە بەڕێوە بووین.

هەموو رێچکەی سەرەو ژوورمان بۆ لای دۆڵی لاپاڵ شاخەکە گرت و هەر بە گەیشتنمان هەموو لێی دانیشتین و ئەوانەی وڵاخیشیان پێبوو، باری وڵاخەکانیان داگرت کە وا بزانم هیچی وای تێدا نەبوو.

خەسرەو بە بێ ئەوەی پشوو بدات، قەمسەڵەکەی بەری داکەند، کە خاکی و سەربازی بوو بە قەمسەڵەیەکی تری، لەگەڵ پێشمەرگەیەک، کە چەرم بوو گۆڕییەوە. هەموو بە تاسووق و چاوی پرسیارەوە تێماندەڕوانی. دیار بوو هەموو دەمانویست لە نهێنی ئەو قەمسەڵە گۆڕینەوەیە بگەین، بۆیە یەکسەر وتی:

_ نابێ بە جلی پێشمەرگەوە بچمە نێو (خانە). قەمسەڵەی خاکیش مایەی گومانە.

پاشان دوو پێشمەرگەی لەگەڵ خۆیدا دەستنیشان کرد کە یەکێکیان خاوەن وڵاخ بوو. ئەوان جلەکانیان ئاسایی بوو، تەنها پێویستی دەکرد چەکەکانیان دابنێن و ئیدی جێی گومان نەبوون.

خەسرەو وتی:

_ لەگەڵ ئەم برادەرانە دەچینە نێو شاری (خانە)و هەندێ خواردن و وردە پێویستی دەهێنین.

هەموو بەو خەبەرە دڵخۆش بووین. مامۆستا عەزیز خێرا خۆی گەیاندە لام و بە چرپە پێی وتم:

_تۆ بڵێی چیمان بۆ بهێنێ!

لەوەڵامدا وتم:

_ کەی ئەوە گرنگە مامۆستا، گرنگ تێر بوونە.

نازانم وەڵامەکەی بە دڵ بوو یان نا. بەڵام ئەو ئیتر بێدەنگ بوو، دیار بوو وەڵامەکەی بە مەعقول دەزانی، چونکە هیچ گرژییەکی پێوە دیار نەبوو.

خەسرەو و پێشمەرگەکانی ئامادەی ڕۆیشتن بوون کە خەسرەو وەک بیری کەوتبێتەوە بە دەنگی بەرز وتی:

_ پێویستمان بە سێ پشتێنە.

داوایەکی سەیر بوو، هەموو بە چاوی پرسیارەوە تێماندەڕوانی، بۆیە بە ئیشارەتێ بۆ پێشمەرگەکان وتی:

جامانەکان دانێن و لەباتی ئەو پشتێنانە بنێنە سەرتان و وەک مێزەرە بیبەستن.

لە روونکردنەوەیدا بۆ ئەوکارەی وتی:

_ لێرە باوی جەمەدانی نییە و کەس نایبەستێ، یان بە دەگمەن دەیبەستێ. هەموو هەر قوماش دەکەنە مێزەر. ئەمە لە کوردستانی ئێران باوە، با ئێمەش سەرنجی خەڵکی بە خۆڕایی رانەکێشین.

وتەکانی مایەی وتووێژو پرسیار نەبوو. کە پشتێنەکەیان نایە سەریان ، تەواو گۆڕان، هەرچەندە ئەوە بووە مایەی پێکەنین بۆ هەموومان، بەڵام بە راستی ئیدی لە خەڵکی ئەو ناوە دەچوون.

ئەوان کەوتنە رێ، تا لەچاو ونبوون، هەر تێماندەڕوانین. پاشان من لە جێی خۆم لەپاڵ بەردێکدا شانم بۆی دادا . مامۆستا عەزیز جارێکی تر هاتە لامەوەو هەر بۆ کردنەوەی بابەتێک وتی:

_ خۆ بە رۆژیش قسەکردن قەدەغە نییە!

دیار بوو دەیویست هەقی بێدەنگ کردنەکەی شەو بکاتەوە بۆیە وتم:

_ نەخێر بە ئارەزووی خۆت قسە بکە، بەڵام تکایە وشەی قەبەو گرانی سیاسی تێکەڵ مە کە....

دیارە هەر بۆ خۆشی وام وت. مامۆستا عەزیز کەوتە قسە و وتی:

_ ئێستا ئیتر بە تەمای چیت؟

بەتەمای چی بم؟ بەڵام لەوەڵامیدا هەر بۆ ئەوەی دەروونی ئاسوودە بکەم وتم :

ـ یەکەمینجار بە تەمام سەرخەوێک بشکێنم و شەکەتی جەستەم بە بابدەم. پاشان پڕ بە دڵ چاوەڕێی ژەمی خواردنی چەور و گەرم و هۆقەیەک شیرینی دەکەم.

ئەمەم وت و چاوم لێکنا.

***

## ٢٨

له غه‌ڵبه‌غه‌ڵب و ده‌نگه ده‌نگ خه‌به‌رم بووه‌وه، دیار بوو خه‌وێکی قووڵم لێکه‌وتبوو، چونکه مێشکم ساف و به‌رچاویشم روون بوو. نازانم چۆن له‌و دۆڵه سارده‌دا خه‌وم لێکه‌وت، هیلاکی و شه‌که‌تی، برسێتی و سه‌رما، هه‌رکامیان بێت ، من ئیتر بۆ خۆم لێی نووستبووم. چاوم به ده‌وری خۆمدا گێڕا. پێشمه‌رگه‌کان هه‌موو له ده‌وری خه‌سره‌و ئه‌ڵقه‌یان به‌ستبوو، ئه‌ویش خه‌ریکی داگرتنی خورجی سه‌ر وڵاخه‌که بوو. له‌وه ده‌چوو بارێک خواردنی هێنابێ چونکه تووره‌که‌که‌ی به ئه‌زیه‌ت بۆ داده‌گیرا. که‌مێک به ده‌نگی به‌رز هاواری کرد و وتی:

_ تکایه هه‌رکه‌س بچێته شوێنی خۆی با به ئاسانی خواردنه‌که دابه‌ش بکه‌م به سه‌رتاندا.

مامۆستا عه‌زیز له ته‌نیشتمه‌وه بوو، دیاره ئاگای له ده‌نگ و باسی خواردنه‌که هه‌بوو، چونکه وتی:

_ بریتییه له سه‌موونی گه‌رم و په‌نیر و مره‌با.

له‌راستیدا مرۆڤ بڕوای نه‌ده‌کرد، دوای ئه‌و برسێتییه‌ی دوێنێ شه‌و، بگه‌ینه خواردنێکی له‌و بابه‌ته. خه‌سره‌و هه‌ر خێرا ده‌ستیکرد به

دابەشكردنی خواردنەكە.

تام و لەزەتی ئەو وەجبە خواردنە وەسف ناكرێ. وامدەزانی لە ئۆتێلێكی گرانبەها دابەزیوم و نانی بەیانی دەخۆم.

سەرێكی شێخ سدیقم دا، لە پەنا بەردێكدا هەڵترووشكابوو، كەمێك خەمبار دەهاتە پێش چاو، دیاربوو هێشتا هەستی لەدەستدانی وڵاخەكەی هەر لەبیردا بوو. سەبارەت بە رێگەی داهاتوو لێم پرسی:

_ لە كوێوە بەرەو كوێ دەڕۆین؟

شێخ سەری لەقاند و كەمێك بە نارەزاییەوە وتی:

_ لە خەسرەو بپرسە.

لەوەدەچوو كەمێك پەست بووبێت، لەوەی كە خۆی رۆڵی دەلیل و رێنیشاندەر ناگێڕێ. من هەر بۆ كردنەوەی بابەتێك، دەمویست بیخەمە قسە، دەنا دەمزانی دەبوو ئەو پرسیارە خۆم لە خەسرەوی بكەم.

هەموو زۆر بە شەوقەوە خەریكی خواردن بوون، هەموو رازی و بێ گلەیی بوون، لەوە دەچوو هەر هەموویان هیلاكیی دوێنێ شەویان كە تا رۆژ بووەوە بە رێگەوە بووین، لە بیر چووبێتەوە.

خەسرەو هاتە لامەوە و وتی:

_ یەكدوو سەموون بخەرە گیرفانەكانت بۆ رێگا، چونكە خوا دەزانێ كەی دەستمان بە ژەمێكی تر دەگات.

من خۆم ئەوەم كردبوو، برسێتی رێگا ئەوەی فێر كردم كە هەمیشە ئیدی گەر دەستم بە پێخۆرێك گەیشت، چەندیشدەتوانم لەگەڵ خۆم هەڵگرم بۆیە هەر بە سەر نیشانەی رەزامەندیم نیشاندا. كاتێك تاریك

داهات، هەموو کۆبووینەوە و ئامادەی ڕۆیشتن بووین کە خەسرەو بە دەنگی بەرز وتی:

ـ ئێستا بەرەو ناو شاری (خانە) دەچین، تکایە جێگۆڕکێ بە جامانەو پشتێنەکانتان بکەن و چەکەکانتان لە خورجی ولاخەکانتان بشارنەوە.

مەبەستی لە جێگۆڕکێی جامانەو پشتێن، ئەوە بوو کە پشتێنە کە بکەی بە مێزەرو جامانەکەش لە پشت ببەسترێت لە جێی پشتێن.

دیارە مەبەستی ئەوە بوو کە هەموو وەک خەڵکی ئەو ناوچانە بنوێنین و کەس گومانمان لێ نەکات.

لە ڕاستیدا دیمەنێکی سەیر بوو ، ئەو پۆلە پێشمەرگەیە ئێستا لە کۆمەڵێ قاچاخچی، یان خەڵکی گوندەکانی دەوروپشتی خانە دەچووین. کە ئیدی بڕوا نەدەکرا سەرنجی کەس بۆ لای خۆمان ڕابکێشین.

لە ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە بۆ بە ناو شاردا بڕۆین بە ولاخەوە!

خەسرەو وتی:

ـ ئیدی کەس گومانمان لێناکات و وادەزانێ خەڵکی دەرەوەی شارین و دەگەڕێینەوە بۆ گوندەکانمان.

پاش کەمێک هەر بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە وتی:

ـ گەر بە قەراخ شاردا بڕۆین، ڕەنگە تووشی سەربازگەیەک، یان لێپرسینەوەیەک بین ، بەڵام ڕۆیشتن بەو ئاشکراییە، بە نێو شاردا، مۆڵەتی گومان ناهێڵێ.

قسەکانی لە ئەزموونی خۆیەوە دەکرد. کە نزیک شار بووینەوە و

پێکانمان کەوتە سەر جادەی قیرتاو، هەستم بە خۆشییەکی یەگجار زۆر کرد، بە تایبەتی کە لەناو شاردا ئەو هەموو رووناکی و رێستۆران و چاخانە و خەڵکە ئاساییەم دەدی، ئەوە هەستی دوور بوون لە شاری لا زیندوو کردمەوە. لە دڵەوە ئیرەییم بەو خەڵکە دەبرد و بەراوردم لەگەڵ خۆماندا دەکرد. ئێمە بە رێگەوە بووین، بۆ هێنانی چەک و داکۆکی لە بوونی خۆمان. کەی ئەم درندانە دەستبەردارمان دەبن و کەی دەتوانین وەک خەڵکی ئاسایی بژین؟. لەراستیدا بۆچوونەکەی خەسرەو راست دەرچوو، ئەگەرچی ئێمە سی کەس بە وڵاخەوە بە ناو جادەکانی شاردا تێدەپەڕین، کەچی کەس، بە تایبەتی ، سەرنجی نەداین. دیارە هەموو وایان دەزانی کە ئێمە خەڵکی گوندەکانی دەورووبەریانین و دەگەڕێنەوە بۆ شوێنی خۆمان.

پۆشینی خۆمان لە سەر پێشنیاری خەسرەو گەلێک سەرکەوتوو بوو، بە تایبەتی مێزەرەکانمان کە هەرچەند زوو زوویش شلدەبووەوەو ناچار دەبووین خێرا خێرا، بیبەستینەوە، یاریدەدەرێکی زۆرباش بوو بۆ گۆڕینی سیمامان.

مامۆستا عەزیز هاتە تەنیشتمەوە و ئانیشکێکی لێدام و وتی:

_ تو شەرەف لە چاوەش ناچم !

چاوەش، گۆرانیبێژە میللییەکان بوو، بۆیە بە توندی دامە قاتای پێکەنین . راستی دەکرد. ئەی ئێمە لە چی دەچووین؟؟.

***

## ٢٩

ورده ورده رووناکی شارەکەمان بەجێهێشت و رووەو تاریکی ملمان نا. بە پێی رێنمایی خەسرەو ئیدی دەبوو لە جادە دوور بکەوینەوە و بەلارێدا برۆین، لە پاساویش بۆ ئەوە دەیوت:

ـــ وڵاخدار بە جادەی قیردا ناڕوات.

کەس لاری نەبوو، ئاوڕم لەشارەکە دایەوە، تەزوویەک بە گیانمدا هات. بە جێهێشتنی، شاری سلێمانیم بیرکەوتەوە، چرکە ساتێکی هەستهەژێن بوو.

تا دەڕۆیشتین، دەورووبەر تاریکتر دەبوو، کەس پرسیاری نەکرد، چونکە دیار بوو بەرەو سنوور و دیوی خۆمان دەڕۆیشتین.

نازانم چەند بوو بە رێگەوە بووین کە ورده ورده باران دەستیپێکرد، بەفر نەبوو، باران بوو، لەسەرەتا لامان خۆش بوو کە بەفر نییە، بەڵام هەر زوو بۆمان دەرکەوت کە لەچۆڵەوانیدا هیچ جیاوازییەکیان نییە.

دیار بوو ئێمە سەرەوژوور دەڕۆیشتین، چونکە تا دەهات رێگەکە

سەختتر دەبوو، من خۆم گەیاندە لای خەسرەو و دەمویست بە وردی بزانم مەنزڵی داهاتوومان کوێ دەبێ.

لەوەڵامدا پێی وتم:

_ ئێمە بەرەو دێی (زێوکە) دەچین، کە دەکەوێتە سەر سنووری خۆمان، ئەمشەو گەر بگەین ئەوا شەو لەوێ دەمێنینەوە و بەیانی بەرەو لای خۆمان دەڕۆین.

ئەم زانیارییانەم هێنایەوە بۆ لای پێشمەرگەکانی خۆمان. هەموو دڵخۆش بوون کە بەرەو ئاوەدانییەک دەڕۆین و مۆڵەتی پشوودانمان بۆ دەرەخسێ.

مامۆستا عەزیز خۆشحاڵی خۆی نەشاردەوە و وتی:

_ بەس نییە لەو بەستەڵەکە رزگارمان بوو.

مەبەستی شاخی قەندیل بوو، ئەگەرچی ئەم شاخانەی کوردستان هەمووی سەخت و بڵندن، بەڵام بڕوامان نەبوو وەک قەندیل دژوار بن.

نازانم شێخ سدیق بەو گوێگرانییەوە ، چۆن گوێی لە ئێمە بوو، چونکە بە دەنگی بەرز وتی:

سەختی زۆرمان لە پێشە، پەلە مەکەن بزانن چی دەبینن.

شێخ کە لەو ماوە دوورو درێژەدا بێدەنگ بوو، دیار بوو دەیویست شارەزایی خۆی، جارێکی تر، بۆ ئێمە دەربخات.

باران تا دەهات خوڕتر دەباری و هیچ پەناگەیەکیش لە ئاسۆدا بەدی نەدەکرا کە خۆمان بدەینە پاڵی و تا باران خۆشدەکاتەوە، لە بنیدا

بحەوێینەوە، بۆیە هەموو بە ناچاری هەر بەردەوام بووین.

قەمسەڵەکەی من بارانیی نەبوو، بڕوام وایە هەموو ئەوانیتریش هەروەک من بوون، بۆیە هەموو بەتەواوی تەڕ بووین. بە رادەیەک من هەستم کرد کە ئاو دەخزێتە نێو شان و ملم و بە پشتمدا دادەچۆڕێت.

قەمسەڵەکان هیچی بارانی نەدەگێڕایەوە. بۆ کەسمان بیرمان لەوە نەکردەوە کە لەم زستانە سەختەی کوردستاندا، پۆشاکێک پەیدا بکەین کە باران و بەفر بگێڕێتەوە. بەڵام ئەوەمان بەو دەست و بردییە بۆ پەیدا دەبوو؟

کەس نارەزایی نیشاننەدا، لەوە دەچوو لای هەموو پێشمەرگەکان بەفر و باران بە دیاردەیەکی ئاسایی لەقەڵەم دەدرا و تەڕ بوون بۆیان هیچ کێشە نەبوو.

ئەم تەڕ بوونە، یەکجار منی نارەحەت کردبوو، سەیریشم لێدەهات کە کەس بۆ ئەو بابەتە فزەی لێنەدەهات. سەراپای گیانم نوقمی ئاو بوو، ئاو دەچووە نێو پێڵاوە لاستیکییەکانم و بەو پێیەش رەوتی رۆیشتنی سەختتر دەکردم، بەڵام منیش وەک هەموو ئەوانیتر، بێدەنگیم هەڵبژارد. ئەی چیم بکردایە؟

تا بەرەو سەرتریش دەڕۆیشتین، رێگەکەمان تاریکتر دەبوو، هیچ رووناکییەکیش لە پێشمانەوە بەدی نەدەکرا تا هیوایەکی لەسەر بنیات بنێین.

پێموایە هیواو نزای دەروونیمان، هەر بۆ ئەوە بوو کە ئەم بارانە خۆش بکاتەوە، بەڵام لە زستانی سەختی کوردستاندا و لەم ناوچە شاخاویانەدا، نزا هیچی بۆ دەکرا و هیواش چۆکی دانەدەدا؟!.

له کاتی وادا ئیدی مرۆڤ دەبێ بیەوێت یان نەیەوێت بەرەنگاری سروشت ببێتەوە. ئەو نایەوێ باران خۆش بکاتەوە و ئێمەش نابێ کۆڵ بدەین و دەستەوئەژنۆ لێی دابنیشین، بۆیە بێ گوێدانە تەڕبوون، هەموو بەردەوام بووین. نازانم چەند بوو بەڕێوە بووین کە پەیامێک لە پێشمانەوە گەیشتە لامان و دەیوت:

ـ بەرانبەرمان پەناگەیەک دیارەو لە ئەشکەوت دەچێ.

خەبەرێکی زۆر خۆش بوو، هەر نەبێ تۆزێک پشوومان دەدا.

که هەموو گەیشتینە نزیک ئەشکەوتەکەو بە وردی لەبەر چەرخی پێشمەرگەکان تێمان ڕوانی، ئەشکەوت نەبوو، پەناگەیەک بوو، بۆ ئێمە سەرو زیاد بوو. هەر بۆیە هەموو خۆمان خزاندە پەناگەکە، هەر نەبێ باران ئیدی نەیدەگرتینەوە.

حاجی بە دەنگی بەرز وتی:

ـ وابزانم ئیتر لێرە پشوو بدەین و تا دنیا ڕووناک دەبێتەوە چاوەڕێ بکەین.

کەس لاری نەبوو، خەسرەویش پشتگیری پێشنیارەکەی کرد، دیار بوو بەو شەوە نەدەگەیشتینە هیچ شوێنێک و دێی داهاتوو کە ( زێوکە) بوو زۆری مابوو.

حاجی دیسانەوە وەک وتار بدات وتی:

ـ هەرچی دەتوانێ با هەندێ پووش و پەلاش و کۆتەرەدار کۆ بکاتەوە، با بیهێنێ و ئاگرێک بکەینەوەو خۆمان برێک وشک بکەینەوە.

پووش و پەلاش بەم بارانە جا چ سوودێکی دەبێ؟ ئەمەم بەخۆم وت، بەڵام منیش وەک پێشمەرگەکان کەوتمە گەڕان، بە شوێن هەر شتێکدا کە بە کەڵکی سووتان بێت . من هیچی وام چنگ نەکەوت ، دەتوت ئەو ناوچەیە هەمووی رووتەنییە و هیچی لێ شین نابێت.

بەڵام ئەوانیتر لە من سەرکەوتووتر بوون ، بە تایبەتی حاجی مەحموود کە نازانم چۆن توانیبووی کۆتەرە دارێکی گەورە پەیدا بکات و خەریکی گڕ تێبەردانی بوو.

ئاگرکردنەوە لە بارودۆخی ئاوادا، ئەزموون و شارەزایی دەوێ کە حاجی هەردووکیانی بە زیادەوە هەبوو.

ئەو شەوە تا رۆژ بووەوە بە دیار ئاگرەکەی حاجییەوە خەریکی خۆ وشککردنەوە بووین، کە هەر وشکیش نەبووینەوە .

***

## ٣٠

که دەوروبەر ڕۆشن بووەوە، بارانەکەش خۆشی کردەوە. لەوە دەچوو سروشت بڕیاری دابێ هەموو شەوەکە باران ببارێنێ بەسەرماندا، بۆیە تا بەرەبەیان هەر دەباری.

هەموو توانیمان لە دەوری ئاگرەکە خۆمان گەرم بکەینەوە، بەڵام جلەکانمان هەر بۆ وشک نەدەبووەوە، ئێمە بە جۆرێک تەڕ بووبووین دەتوت باڵندەی بەر بارانین.

ئەوەی ڕاستی بێت ئەو پەناگەیە، بەو شەوە تاریک و باراناوییە بۆ ئێمە دیارییەکی خودایی بوو.

لە ڕاستیدا ئەوەی بیرمان لێنەکردبووەوە بارانێکی وا خەست و بەردەوام بوو. ئەوە هیچ خۆمان هەموو نوقمی ئاو بووین، ئەوەش هەر کێشە نەبوو، بەڵام هەرچی خواردنمان پێبوو، کە لە خورجی ولاخەکاندا بوو، هەر هەمووی بە تایبەتی نان و سەموونەکان، بوو بە هەویر، بە ڕادەیەک بە هیچ جۆرێک نەدەخورا.

سەرزەنشتی کێمان بکردایە، کەسمان بیری ئەوەمان نەبوو، یان

چاوەڕێی ئەوەمان نەدەکرد تووشی بارانێکی بەوجۆرە بین. بەڵام تازە کار لە کار ترازابوو. هیچ چارێک لە فرێدانی نان و سەموونەکان، زیاتر نەبوو. ئەوەی باش بوو چەند شووشەیەکی گچکە لە مرەبا کەڵکی پێوەمابوو، بۆیە توانیمان سوودی لێوەرگرین و سەرو یەک کەوچکی لێ هەڵێنجین کە بۆ ئێمە لەوکاتەدا وزە بەخشێکی بێوێنە بوو. کەوتینە ڕێ، بەڵام لە مەدای چاودا هیچ ئاوەدانییەک نەدەبینرا. لە پرسیاری ئەوە کە چەندی تر دەگەینە زێوکە، خەسرەو وتی:

_ بڕوا دەکەم دەمەو نیوەڕۆ بگەین.

ڕەنگ بوو ، گەر دووچاری ئەو بارانە زۆرە نەبووینایە و شەو بەردەوام بڕۆیشتینایە دەگەیشتینە ناو دێ. بەڵام ئەو تۆف و بارانە خوڕە، مۆڵەتی دەدا؟

ئەو خەبەرەش بۆ ئێمە ، هەر باش بوو، هیوایەکمان پەیدا کردەوە کە بەو زووانە دەگەینە ئاوەدانی و پشوویەکی باش دەدەین.

خەسرەو هاتە تەنیشتمەوە، دەیزانی شەوی پێشوو زۆر هیلاک بووین ، هەر بۆ دڵنیایی وتی:

_ من ناسیاوی باشم لە زێوکە هەیە.

وەک خۆی باسی کرد، ئەو هەر لەو ڕێگەیەوە بەرەو قەندیل هاتبوو. چەند شەوێک لەو دێیە مابووەوەو ناسیاو و دۆستی پەیدا کردبوو. لە ڕاستیدا مرۆڤ زوو دەبووە برادەری خەسرەو. مرۆڤێکی ڕووخۆش ، قسە زان، بە ئاگاو نیشتمانپەروەر. ئەوەی تێبینی دەکرا، هەمیشە ئامادەگی خۆی بۆ هەموو دەستپێشکەرییەک نیشان دەدا و مرۆڤ هەستی دەکرد کە سەراپا گیانی تژییە لە قوربانی، من لەو ماوە

کەمەدا، ئەگەرچی زیاتر هەر بەرێوە بووین و هێندە مۆڵەتی قسە کردنمان نەبوو، بەلام لەگەڵ ئەو وتووێژە کەمانەی پێکەوە دەمانکرد، زانیم کە مرۆڤێکی پاک و کوردپەروەرێکی بێ گەردە.

مامۆستا عەزیز، ئەویش هاتە نزیکمان ، دیار بوو حەزی دەکرد بەشداری وتووێژەکانمان بکات. نازانم گوێی لە پرسیارەکەی من نەبوو، چونکە ئەویش هەر ئەو پرسیارەی کرد کە چەندمان ماوە بگەینە زێوکە.

من وەلامم دایەوە، دەمویست منیش شارەزایی خۆم نیشان بدەم، ئەگەرچی زانیارییەکانم هەمووی لە خەسرەو وەرگرتبوو. وتم:

_ بە ئیحتمالی زۆر دەمەو نیوەڕۆ دەگەین.

مامۆستا عەزیز بە سەرسوڕمانەوە سەیری کردم و یەکسەر وتی:

_ جا تۆ چوزانی؟

وەک مرۆڤێکی شارەزاو دونیادیدە سەرم بۆ لەقاند و وتم:

_ زۆر شارەزام ، تۆ نازانی!.

هەردوو چاوی ئەبلەق بوو، وتی:

_ ئاخر چۆن؟

ماوەیەک بێدەنگ بووم، وام نیشاندا کە بیر لە پرسیارەکەی دەکەمەوە. بێسەبرانە وتی:

_ وەلامت نەبوو؟

سەرم بۆ لەقاند و پاشان زۆر لەسەرخۆ وتم:

_ هەموو ئەم زانیارییانەم هەر ئێستا ، گەرم و گوڕ، لە هاوڕێ خەسرەو بیست، بۆیە هیچ جێی گومان نین.

مامۆستا عەزیز دایە قاتای پێکەنین.

بە هەرحاڵ وەڵامەکەی زۆر پێخۆشبوو، تا رادەیەکیش دڵنیا بوو کە بەو زووانە دەگەینە ئاوەدانی.

لای نیوەڕۆ، لە دوورەوە دێیەک بەدی دەکرا، تا نزیک دەکەوتینەوە خانووەکانی باشتر دەردەکەوتن. دوکەڵی سەربانەکان، قەف قەف رووەو ئاسمان دەچوون، سەگوەڕ دەبیسترا، ژنان و کچانی دێ رووەو کانی دەچوون، هەندێک بەر ماڵەکانیان لە بەفر پاکدەکردەوەو چەند پیاوێکیش لە چەند سەربانێکی دوورەوە دەەبیندران کە بە بەفرماڵ خەریکی ماڵینی بەفری سەربانەکانیان بوون .

دیمەنەکە هەموو زیندوویی ئاوەدانییەکەی نیشان دەدا.

پێش ئەوەی بگەینە ناو دێ ،خەسرەو هەموانی راگرت و وتی:

_ ئێستا لە سەر دەستووری خۆمان بە ماڵەکاندا دابەش دەبین، ئەوەی باشە ئەم دێیە هیچ سەربازگەو بوونی دەوڵەتی تێدا نییە. بۆیە دەتوانین تا سبەی، ئاسوودە تێیدا بحەسێینەوە و سبەی بەردەوام بین.

ئەوەش خەبەرێکی خۆش بوو کە دڵنیای کردین کە دەوڵەتی ئێران لەو دێ سەر سنوورییە هیچ بوونێکی نییە، بۆیە دەمانتوانی پشوویەکی بێ ترسی تێدا بدەین.

کە هەموو پێشمەرگەکان، بە ماڵەکاندا دابەشکران، خەسرەو پەلی

منی گرت و وتی:

_ ئێمەش دەچینە ماڵی ناسیاوەکەم.

ئەو پێشوازییە گەرمەی لێمان کرا لەو ماڵە، گەواهی رادەی دۆستایەتی و خۆشەویستی خانەوادەکەیان بۆ خەسرەو دەنواند.

ئای ئەو رۆژە چ خزمەتێکیان کردین و تا درەنگانی شەو هەر میهرو رێزو میواندۆستی خۆیان بەسەرماندا دەپرژاند.

***

## ٣١

کە بەیانی لە ماڵ هاتینەدەر، هەستم بە پشوودانێکی تەواو دەکرد. جلەکانم هەمووی لەلایەن کەیبانووی ماڵەوە بەتەواوی وشککرابوونەوە، ئەویش هێندەی تر باری دەروونی ئاسوودەتر دەکردم. لە ناوەندی دێ هەموو پێشمەرگەکان گردببوونەوەو چاوەڕێی ئێمەیان دەکرد، یان راستتر وایە بڵێم چاوەڕێی خەسرەویان دەکرد، چونکە شارەزای سەرەکیمان ئەو بوو. من سەرم بۆ ئاسمان بەرز کردەووە. ئاسمانێکی سافی بێگەرد، شین دەچۆوە، رۆژیش لە شاخەکەی لای چەپمانەوە وردە وردە هەڵدەکشاو تیشکی زیوینی بە سەردێ دا دەپرژاند. رۆژێکی تا بڵێی خۆش بوو، بەڵام سەرما هەر وەک خۆی بوو، بەفر بە شاخەکانی دەورووبەرمانەوە دەبینران، دیمەنێکی دڵڕفێن بوو.

خەڵکی گوندەکەش لە نزیک پێشمەرگەکانەوە دەبینران و گوێیان بۆ وتووێژی نێوانیان شل کردبوو. باس هەر باسی رێگەوبان بوو. بڕۆین یان نەڕۆین و شەوێکی تر لە دێ بین یان نەبین.

دوور و نزیکی رێگاکەمان تاووتوێ کرد. هەموو بەشدار بووین، بە تایبەتی ئەوانەی شارەزای ئەو رێگەیە بوون . وەک دەرکەوت، حاجی

مەحموود و شێخ سەدیق ئەوانیش شارەزای ئەو رێگەیە بوون، هەرچەند هەموو گوێمان زیاتر لە خەسرەو دەگرت.

خەسرەو دەیوت رێگاکەمان رۆژێکی تەواو دەخایێنێ و گەر بمانەوێ برۆین ئیدی با زیاتر خۆمان دوا نەخەین. من زوو زوو سەیری ئاسمانم دەکرد، سەرەتای زستان بوو، تا دوا بکەوتینایە زستان سەختتر دەبوو، بۆیە لە بەرژەوەندی هەموو لایەکمان بوو کە برۆین.

خەڵکی دێیەکەش بەشداری وتووێژەکانیان کردین، وەک عادەتی هەمیشەیی دەیانوت رێگەکە هێندە سەخت نییە و گەر باش برۆین زووتریش دەگەین. نازانم هۆکاری ئەو رێ نزیککردنەوەیە بەلای گوندییەکان ئەوەیە کە زوو دێکانیان جێبهێڵی و تووشی دەردی سەرییان نەکەیت یان لە شارەزاییەوە ئەوەیان دەوت. بە هەر حاڵ ئەوانیش لایەنگری ئەوە بوون کە هیچ دوو دڵ نەبین و برۆین.

خەڵکی گوندەکە وەک دڵنیا بووبن لە رۆیشتنمان توورەکەیەک نان و پەنیرو پیازیان بۆ هێناین و بە شەرمەوە وتیان:

ـ رەنگە پێویستیش نەبێت، بەڵام نانی زیاد سەر ناشکێنێ.

ئەوەش مانای خواحافیزی بوو، بۆیە ئیتر کەسمان دوو دڵ نەبووین و لاریمان لە رۆیشتن نەبوو.

کەوتینە رێ، بە هەورازێکدا سەرکەوتین، هەوا تا دەهات ساردتر دەبوو، تا نیوەڕۆژ سەرەوژوور دەڕۆیشتین، من جاروبار سەیری ئاسمانم دەکرد. وردە وردە هەوری سپی بە ئاسماندا بڵاو دەبۆوە، سەرەتایەکی باش نەبوو. بە دوودڵییەوە تێمدەڕوانی ، مامۆستا عەزیزیش بە گومانەوە سەیری ئاسمانی دەکرد، لێوی دەبزواند. نازانم چی دەووت بەڵام لە

سەروهەیئەتیدا گومان بەدی دەکرا. تا زیاتر سەردەکەوتین بەفری سەر شاخەکە زیاتر دەبوو. کە گەیشتینە سەر شاخەکە من وامدەزانی ئیدی داگەڕانەوە سەرەوخوار دەڕۆین. بەڵام وا دەرنەچوو، تا چاو بڕی دەکرد شاخی تر بوو. من وامدەزانی ئەم شاخەی پیایدا سەردەکەوین، ئەو دیوی، دیوی خۆمان دەبێ، بەڵام وا دەرنەچوو.

کە سەرم بۆ دوایین جار بەرز کردەوە، ئاسمان بە تەواوی هەور دایگرتبوو، هەورێکی خەست. بای ساردی سەر شاخەکەش تا دەهات زیاتر سارد دەبوو.

لە ناکاودا، پرووشە بەفر هەڵیکرد، لە سەرەتادا، شتێکی ئەوتۆ نەبوو، بەڵام لە ساتێکی یەکجار کورتدا، بەفر بە جۆرێک دایکرد، چاو چاوی نەدەبینی. من وامزانی دەگەڕێینەوە بۆ خوارەوەو دەچینەوە ناو دێ و چاوەڕێ دەکەین تا بەفر خۆشدەکاتەوە، بەڵام وا دەرنەچوو. حاجی بە دەنگی بەرز هاواری کرد، دیارە دوای بۆڵە بۆڵی پێشمەرگەکان کە بۆ نەگەڕێینەوە، وتی:

ـ چی بگەڕێنەوە وا بۆ پێنج سەعاتە بەرێگەوەین. ئەوەندەی دەگەڕێینەوە دەگەینە دیوی خۆمان.

پاش تۆزێک وەک فەرمانی سەربازی بدات وتی:

ـ بەردەوام بن لە ڕۆیشتن. دوو دڵ مەبن زۆرمان نەماوە.

تا ئەو ساتە بەفری وا چڕ و خەست و بەردەوامم نەدی بوو، دەتوت هەزاران فەردە لۆکە پێکەوە لە ئاسمان بەردەدرێتەوە بە سەرماندا. مرۆڤ پێش خۆی نەدەدی.

حاجی و خەسرەو پێشمان کەوتبوون، من سەیری پێشەوەم دەکرد،

هیچ رێگایەک بە دی نەدەکرا، هەموو دەورووبەر سپی دەچووەوە. نازانم ئەوانەی پێشەوە چۆن رێیان دەکرد!.

عەزیز هاتە لامەوە بە نیگەرانییەوە وتی:

_ بەم بەفرە رێگە نابینرێ. ئەمانە چۆن دەڕۆن.

تێبینییەکی بەجێ بوو، بەڵام چار لەوە زیاتر کە بڕۆین و نەوەستین، هیچی تر هەبوو؟.

دەورووبەر تا دەهات تاریکتر دەبوو، هەر کلووی بەفر کە بە لێشاو دەهاتە خوارێ بە دی دەکرا. داگەڕان نەبوو، ئەو سەر شاخە دەتوت دەشتێکی تەختەو تا چاو بڕی دەکرد هەر بەفر بوو.

ئێمە هەموو هەر دەڕۆیشتین، بێ پشوودان، بێ وەستان، هەموو، هەرچی هێزو توانامان هەبوو خستبوومانە خزمەت قاچەکانمان و بەفرمان دەشێلا. ئاسۆی بەردەمیشمان بێ کۆتایی بوو.

شەو داهات و بەفریش هەر زیاتر دەبوو، ئێمەش هەر دەڕۆیشتین. نازانم ، هیچ رێگەیەک نەدەبینرا، بەڵام ئەوانەی پێشەوەمان هەر دەڕۆیشتن.

من گومانم نەما کە ئەمە رۆیشتنێکی بێ ئاکامە ، چونکە هیچ نەدەبینرا، سەرو خوارو راست و چەپمان بۆ جیا نەدەکرایەوە. لەراستیدا تەنها دوای وڵاخەکان کەوتبووین. دەلیلمان تەنها ئەوان بوون. ئیدی نازانم بۆ کوێیان دەبردین.

بەفر هەر بەردەوام بوو، هەستم کرد، تەختایی نامێنێ و سەردەکەوین بەڵام بۆ کوێ؟ کەس نەیدەزانی بەڵام ئێمە هەر بەردەوام بووین.

کەس باسی خواردن و برسێتی نەدەکرد. گرنگ لەو کاتەدا خواردن نەبوو. ژیانمان کەوتبووە مەترسییەوە، نەماندەزانی بۆ کوێ دەڕۆین. هیچ ڕۆشناییەکیش بەدی نەدەکرا. بەرەو نادیار دەڕۆیشتین.

حاجی هاواری لێ هەستایەوەو وتی:

_ لەراستیدا هیچ ڕێگەیەک نابینم، ناڵێم ڕێگەمان ون کردووە، بەڵام ڕەنگە ونیشمان کردبێت.

خەبەرێکی خۆش نەبوو بۆ ئێمە ، بەڵام هیچمان نەوت ، مامۆستا عەزیز هاتە لامەوە. دەلەرزی و دەمی گۆی نەدەکرد وتی:

_ چیمان بە سەر دێت؟

وەڵامم پێنەبوو.



## ٣٢

بەفر بەردەوام دەباری و وچانی نەدەدا، تەنها دەنگێک کە بە ئاسانی دەبیستراً، پرمەی ولاخەکان بوو، وابزانم ئەوانیش لە بێ پشووییدا، تینیان بۆ هاتبوو. ئێمە بێ ئامانج دەڕۆیشتین، چونکە هیچ ڕێگایەک نەدەبینرا و نەماندەزانی رووەو کوێ دەڕۆین. تەنها شتێک کە لامان دیار بوو، هەر ئەوە بوو کە بەرەو نادیار دەڕۆیشتین.

هەموو ترسی ئەوەمان لێنیشتبوو کە شەو لەم کێوەدا بە سەر ببەین، بەو سەرمایەش گومان نەبوو کە هەموو رەق دەبینەوە.

دەنگی نارەزایی بەرز بووەوە کە بەرەو کوێ دەچین و بۆ ناگەڕێینەوە، بۆیە کاروانەکەمان هەمووی وەستا. لە ژێر ئەو تەوژمە بەفرەدا کە مۆڵەتی بینینی بەتەواوەتی نەدەدا، کەوتینە وتووێژ. نە حاجی و نە خەسرەو، نە کەس دەیزانی بەرەو کوێ دەچین. تەنها چاریش هەر ئەوە بوو کە بڕۆین، چونکە حاجی وتی:

_ گەڕانەوە مەحاڵە، وا بۆ نیوەشەو دەچێ ئێمە بەڕێگەوەین واتا گەر بشگەڕێینەوە، کە نازانین چۆن، یانێ ئەوەندەی ترمان دەوێت، بۆیە بەردەوام بین چاکترە.

هەر یەکەو شتێکی دەوت ، کەس پێشنیارێکی بەجێی پێنەبوو، چونکە هیچ رێگەیەک بۆ گەڕانەوەشمان بەدی نەدەکرا. لە راستیدا ئێمە لە بەفردا ون بووبووین، پاشان حاجی بە دەنگی بەرز وتی:

_ چار هەر رۆیشتنە، بۆ ئەوەی لە سەرما رەق نەبینەوە.

چارەسەر هەر ئەوەبوو. کەوتینەوە رێ. تا دەهات وزەو تینمان لێدەبڕا، لەگەڵ ئەوەشدا ترسی مردن، وزەی نوێی پێ دەبەخشین، بۆیە هەموو بەردەوام بووین.

نەمزانی چەندە بەڕێوەین کە جارێکی تر حاجی هاواری کردەوە، وتی:

_ لەراستیدا ئێمە بەدەوری خۆماندا دەخولێینەوە.

هەموو حەپەساین. مەبەستی چی بێت. مامۆستا عەزیز هاتە نزیکمەوەو وتی:

_ ئەوە چی دەڵێ؟ شێت بووە؟ خولانەوەی چی؟

حاجی کەوتە باسی تیۆرییەکەی ، وەک کەسێکی شارەزا لە رێگەوباندا وتی:

_ سەیری جێ پێکان بکەن، ئەوە هەمووی شوێن پێی ئێمە و وڵاخەکانە. ئەوەش یانێ ئەوەی ئێمە ماوەیەکی زۆرە بە دەوری خۆماندا دەسووڕێینەوە.

هەموو سەیری بەر پێی خۆمان دەکرد، حاجی ئیشارەتی بۆ شوێن پێکان دەکرد. راستییەکی حاشا هەڵنەگر بوو.

مامۆستا عەزیز هاواری کرد و وتی:

_ ئەی حاجی چار؟ چی بکەین؟

حاجی وەک مرۆڤێکی دنیادیدە کە سەختی و ناڕەحەتی زۆری دی بێت وتی:

چار هەر ڕۆیشتنە، تا ڕۆژ دەبێتەوە. بەم شەوە تاریک و نووتەکە هیچمان لێ حاڵی نابێت.

یانێ تا ئەو ساتە ئێمە تەنها بەفرمان دەشێلا و بێهودە دەڕۆیشتین. تەنها سوودێک لەو ڕۆیشتنە هەر ئەوە بوو کە ڕەق نەبینەوە.

حاجی جارێکیتر کاروانەکەی ڕاوەستاند و وتی:

_ با پشوویەک هەر بە پێوە بدەین.

ئەمەی وت و خورجی وڵاخێکی داگرت و کەوتە دابەشکردنی نان. هەر چەند کەس داوای نانیشی نەکردبوو، چونکە هەموو مەترسی گەورەترمان لە برسێتی لە پێش بوو، لەگەڵ ئەوەشدا سەرو نانمان وەرگرت. مامۆستا عەزیز بێ سەبرانە وتی:

_ ئەی ئاو؟.

پرسیارێکی بەجێ بوو، کەسمان ئاومان پێنەبوو، هەرچەند زۆربەی پێشمەرگە مەتارە هەڵدەگرێ بۆ کاتی پێویست، بەڵام ئێمە کەسمان مەتارەمان پێنەبوو. هۆکارەکەش هەر ئەوە بوو کە ئێمە بەرەو کوێستان دەچووین و دەورووبەر هەمووی دەبوو کانیاوو سەرچاوە بێت، بەڵام لەم شاخە سەختە و بەم بەفرە، کانی دەستدەکەوت؟

لە پەناوە بە مامۆستا عەزیزم وت:.

_ وەختێ ئاو نییە، بە بەفرەوە بیخۆ.

عەزیز دیسانەوە هاواری لێ هەستاو وتی:

_ ئەی پەنیر؟ ئەی پیاز؟!.

کەس وەڵامی نەدایەوە، بۆیە منیش وتم:

_ داینواوە بۆ کاتی تەنگانە!.

ئەویش لە سەری نەڕۆیشت، ئەگەرچی تەنها نانێکی وشک و بەو هیلاکییە هێندە وزە بەخش نەبوو ، لەگەڵ ئەوەشدا ئاهێکمان پێداهاتەوەو لە سەر ڕۆیشتن بەردەوام بووینەوە. ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام ، نانەکان تەڕ نەبوون. دەبێ ئەمجارە شارەزایانە پێچابێتەوە.

ئەوەی کە ئێمە بە دەوری خۆماندا دەخولاینەوە ، تەواو بێ هیوای کردین، لەگەڵ ئەوەشدا هەر بەردەوام بووین. گرنگ ئەوە بوو بەجۆرێک بڕۆین نەگەینەوە سەر شوێن پێکانی خۆمان، بۆ ئەم مەبەستەش ڕێک و ڕاست دەڕۆیشتین و بە هیچ لایەکدا لامان نەدەدا.

نازانم چەندی تر بەردەوام بووین، کە لە دوورییەکی زۆرەوە ڕۆشناییەک لە ئاسماندا دەبینرا. لەوە دەچوو ئاوەدانی بێت، چونکە ئەو ڕۆشناییە زۆرە هەر لە ڕووناکی شار دەچوو.

مامۆستا عەزیز هاتەوە نزیکم ، دیار بوو ئەویش ئەو ڕۆشناییە سەرنجی ڕاکێشابێت، چونکە وتی:

_ ئەو ڕۆشناییە بە چی تێدەگەیت؟

لە ڕاستیدا نەمدەزانی چییە، چاومان ڕەشکەو پێشکەی دەکرد یان ئەوە هێمای ئاوەدانی بوو. هەر بۆ دڵخۆشکردنی وتم:

_ ئەوە شارە!.

لە وەڵامدا وتی:

دهۆک؟!.

دهۆک دەکەوتە ناوچەی بادینان، ئێمە جارێ هێشتا لە سنووری ئێران بووین. نازانم بۆ خۆشی وای وت یان بە راستی وای هەست دەکرد کە ئەو رۆشناییە دەبێ هەر دهۆک بێت. دیار بوو ئەو حسابی ئەو ماوە زۆرەی دەکرد بەڕێوە بووین و بەو پێیەش ، لای ئەو دەبوو ئەو رۆشناییە ناوچەی بادینان بێت.

کە زیاتر نزیک کەوتینەوە خۆشحاڵی هەموومانی گرتەوە، چونکە شاخەکەش دادەگەڕاو ئێمە سەرەوخوار دەچووین.

بەفر وردە وردە خۆشی دەکردەوە، تەنها پرووشەی بەفر، کە وابزنم با دەیهێناو بە سەروچاومانی دا دەدا، دەنا ئیدی بەفر نەدەباری.

کەس نەیدەزانی ئەو رووناکییە کوێیە ، بەڵام هەموو دڵنیا بووین کە ئەوە شارێکی گەورەیە ، ئەوەش بۆ ئێمە هێمای قوتار بوون بوو لە مەرگێکی مسۆگەر.

مامۆستا عەزیز، لەگەڵ ئەوەی دەروێشێکی (ماوتسیتۆنگ) یش بوو وتی:

خوامان لە پشتە!!.

لە وەڵامدا وتم:

توخوا؟

* * *

## ٣٢

ڕۆشناییەکە، بۆ هەمووومان، هیوای بەردەوامی ژیانی رادەگەیاند. مرۆڤ لەو پەڕی سەختیدا نابێت ورە بەربدات. من زۆر خۆشحاڵ بووم کە ئەمجارەش لە مەرگێکی مسۆگەر رزگارمان بوو، وا بزانم ئەوانی دیکەش هەر وەک من بوون.

بە شاخەکەدا دادەگەڕاین و ڕووەو ڕۆشناییەکە ملمان دەنا. کە لە شاخەکە هاتینە خوارەوە دێیەکی گەورە هاتە بەردەممان کە تا ئەو کاتە لێمانەوە دیار نەبوو. ئەگەرچی کات لە نیوە شەویش تێپەڕی کردبوو، بەڵام چرای زۆربەی ماڵەکان هەر دەسووتا. لەراستیدا نەماندەزانی ئەو شوێنە کوێیە، بەڵام ئەوە بۆ ئێمە هیچ گرنگ نەبوو ، گرنگ ئاوەدانی بوو.

کە چووینە نێو دێ و بە کۆڵانەکاندا دەڕۆیشتین، هەندێک لە خاوەن ماڵەکان بە خەبەر هاتن. دیارە ڕۆیشتنی ٣٠ کەسی بەدوای یەکدیدا و بە وڵاخەوە نەدەتوانرا بە بێدەنگی ڕەوت بکات.

لە سەری کۆڵانێکدا دوو پیاو وەستا بوون و بە سەرسوڕمانەوە تێیان دەڕوانین. دیارە لایان سەیر بوو کە خەڵکی بە چەکەوە بە ناو دێ دا

تێپەڕێ.

ئێمە وەک مامۆستا عەزیز پێشبینی دەکرد، چاوەڕێی ئەوە بووین کە خەڵکی بە زاراوەی بادینی بماندوێنێ، بەڵام وا دەرنەچوو، چونکە بە سۆرانییەکی رێک و رەوان بە خێرهاتنیان کردین بۆیە یەکسەر بە مامۆستام وت:

_ بۆچوونەکەت وا دەرنەچوو.

ئەویش بێ سێ و دوو وتی:

_ ئەوە هەر گرنگ نییە، گرنگ ئێمە گەیشتینە ئاوەدانی، جا سۆران بێت یان بادینان.

لە پرسیاری ئەوەی کە ئەو دێیە کوێیە، یەکێک لە گوندنشینان بە شانازییەوە وتی:

_ شێخان.

پاشان وتی:

_ ئێمە دێیەکین سەر بە شارۆچکەی شنۆ.

ئەمەی وت و دەستی بۆ لای رۆشناییەکی ئاسمان راکێشاو وتی:

_ ئەوەش شاری شنۆیە.

کە واتە حاجی راستی دەکرد، ئێمە بە پێچەوانەوە رەوتمان دەکرد، لە باتی ئەوەی روو بکەینە سنووری خۆمان و بۆ دیوی کوردستانی عێراق بچین، بەرەو ئێران داگەڕاوین. ئەمەش هەر ئەوەی دەگەیاند

که ئێمه سەراپای ڕۆژ و شەوەکە بە خێرایی ڕۆیشتبووین و هاتبووینە نێو قووڵایی ئێرانەوە، هەر بۆیەش گوندییەکان وا بە سەرسامییەوە لە چەکەکانیان دەڕوانی.

حاجی مەحموود پرسیاری لە گوندییەکان کرد و وتی:

_ ئەدی مزگەوت لە کوێیە؟

ئەوانیش بە خۆشحاڵییەوە پێشمان کەوتن و بردینیاینە نێو مزگەوتی دێ.

هەموو شەکەت و برسی و هیلاک و شپریو بووین. هەستم کرد زۆربەی پیاوانی دێ هاتبوونە دەرەوەو رووەو مزگەوت دەهاتن. لە ناوخۆیاندا مقۆ مقۆیان بوو، هەربۆیەش خەسرەو وەک روونکردنەوەیەک بە دەنگی بەرز وتی:

_ برایینە، ئێمە هەموو پێشمەرگەی کوردستانی ئەو دیوین و ئەمشەو ڕێگەمان لێ بزر بووە، بۆیە روومان لێرە کردووە.

هەموو زۆر بەخێرهاتنیان کردین و ئێمەش یەک بەدوای یەکدا چووینە ژووری مزگەوت.

مزگەوتی دێ تا بڵێی گەورە، پڕ فەرش، تا رادەیەک گەرمیش بوو.

لەوە دەچوو هێشتا گەرمی زۆپا گەورەکەی کە لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا بوو، پێوە مابێ، لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکانی نێو دێ هەر خێرا جارێکیتر ئاگریان بەردایە زۆپاکەو زۆربە زوویی گەرمی بە نێو ژوورە گەورەکەدا بڵاو بووەوە، هەر بۆیەش هەموو لە دەوری گردبووینەوە.

ئەمە وەک موعجیزە، یان خەوێکی خۆش دەهاتە پێش چاو، پێش ئێستا، هەموو هیوا بڕاو بووین و چاوەڕێی ئەوەمان دەکرد کە لە سەرما رەق بینەوە، کەچی وا لە بەردەم رۆپای گەرمدا، ژیان جارێکی تر دەچێتەوە بەبەرماندا.

دانیشتووانی دێ زۆر بە زوویی فریامان کەوتن، یەکێ نانی دەهێنا، یەکێک بە کتری چای دەهێنا. لەچاو تروکانێکدا بە دەیان سینی پڕ لە پێخۆر، خۆی کرد بە ژوورا. میوانداریيەکی، لەو نیوەشەوەدا، بێوێنە بوو.

هەموو تا توانیمان خواردمان، دەتوت لە دەمی گورگی برسی بەربووین. پاشان هەر ماڵەو بەتانییەک، یان لێفەیەک یان دۆشەکێکی لەگەڵ خۆی بۆ مزگەوتەکە هێنا. لە راستیدا بەماوەیەکی کورت هێندە خزمەتیان کردین کە نەماندەزانی چۆن سوپاسگوزاری خۆمانیان بۆ دەربڕین.

مامۆستا عەزیز پێکەنینی لێ دەباری، هاتە نزیکمەوە، منیش هەر بۆ خۆشی وتم:

ـ تۆ واتدەزانی ئێرە دهۆکە.

دیار بوو لە مەبەستەکەم تێدەگەیشت، چونکە لە وەڵامدا وتی:

ـ کورد هەر کوردە لە هەر کوێ بێ، بۆ ئێمە هەر یەکە.

سەری رەزامەندیم بۆ لەقاند و وتم:

ـ بڕوات دەکرد ئەمشەو بگەینە ئاگر و پێخۆر؟

دایە قاقای پێکەنین و وتی:

_ به شه‌ره‌فم له ژێره‌وه شایه‌تمان ده‌هێنا، ئه‌وه تۆ ده‌ڵێی چی؟.

خه‌سره‌و نیگه‌ران ده‌هاته پێش چاو، من وامزانی به گه‌یشتنمان به ئاوه‌دانی خۆشحاڵ ده‌بێ ، بۆیه وتم:

_ بێتاقه‌تیت یان هیلاک؟

له‌وه‌ڵامدا وتی:

_ هیچیان .

وتم:

_ ئه‌ی بۆ وا نیگه‌ران دیاری؟

سه‌ری له‌قاند. تێنه‌گه‌یشتم . وتی:

_ ئێره ئێرانه .

به‌ڵگه‌نه‌ویست بوو، خه‌ڵکی نێو دێ، جوگرافیای ناوچه‌که‌یان بۆ باسکردین. ده‌مانزانی له کوێین بۆیه وتم:

_ جا با ئێران بێت. ئێمه ئیشمان به ئێران چییه، به‌یانی ده‌که‌وینه‌وه رێ.

خه‌سره‌و سه‌ری باداو وتی:

_ ئێمه زۆر هاتووینه‌ته قووڵاییه‌وه.

راستی ده‌کرد، به‌ڵام چار چی بوو، ئێمه به ئاره‌زووی خۆمان نه‌هاتبووین. رێگه‌مان ون کردبوو، ده‌نا ئێمه کارمان به نێو ئێران چی

بوو.

سەری لەقاند بۆم. دیارە نەیدەویست زیاتر لە سەری بڕۆین. حاجی و پێشمەرگەکان هەریەکەو بەتانییەکی بە خۆی دا داو لە سووچێکی مزگەوتەکە لێی راکشا.

چاوم بەناو پێشمەرگەکاندا گێڕا، بۆ شێخ سدیق دەگەڕام. خەریکی وت و وێژ بوو لەگەڵ گوندییەکدا. لەوە دەچوو پرسیاری رێگەو بانی لێ بکات. بانگم کردە لای خۆمەوە و وتم:

ـ چییە یا شێخ بۆ وا بێدەنگی؟

چاوی بڕییە نێو چاوانم، وەک سەرزەنشتم بکات، وتی:

ـ بۆ دەلیلی، من چاکتر نەبووم؟

پرسیارێکی گران بوو، بۆیە بێدەنگ بووم. نەمویست دڵی یاشێخ زوێر بکەم. ئەویش دەلیل بوایە هەروا دەبوو.

*** 

## ٣٤

لەگەڵ خەسرەو ، ئێمە دوایین کەس بووین کە راکشاین لە نزیک زۆپاکەوە. نازانم چەند دەبوو نووستبووم کە گوێم لە دەنگێک بوو، بە زمانێکی تر دەدوا . چەند جارێک چاوم هەڵبڕی، تارمایی کەسێکم بە جلی سەربازییەوە دەدیت.

چاوم لێکدەنایەوە، بەڵام هەرگوێم لە وتەکانی بوو کە هیچیش تێنەدەگەیشتم. وامدەزانی خەو دەبینم، چونکە جگە لە من کەس بە خەبەر نەبوو، ئەگەرچی ئەوەشم دەزانی کە پێش نووستن، پێشمەرگەیەکمان وەک پاسەوان لە بەر دەرکی ژوورەکە دانابوو، بۆیە وام هەست دەکرد کە دەبێ ، ئەوەی دەیبینم هەر خەو بێت. تارماییەکە هەر بەردەوام بوو، چاوەکانم هەڵگڵۆفی، ئەمجارە مرۆڤێکم بە جلی سەربازییەوە لەبەرچاو بەرجەستە بوو. ئەو قسەی بۆ ئێمە دەکرد. کە باشتر سەرنجم دا، ئەگەرچی نێو ژوورەکەش، لەبەر تیشکی لاوازی چرای سەر دیوارەکە، زۆر رووناک نەبوو، بەڵام من ئەستێرەی سەر شانی سەربازەکەم بە جوانی بەدی کرد. دیار بوو ئەفسەر بوو، بەڵام بۆ هاتبووە ژووری مزگەوت و بۆ قسەی بۆ دەکردین کە دەشیزانی هەموو خەوتووین، دەیویست چی بڵێ یان چی دەویست. من هیچ

حاڵی نەبووم، هەر بۆیەش ئانیشکێکم لە خەسرەو کوتاو بە خەبەرم هێنایەوە. وەک ئەویش بڕوا بەو دیمەنە نەکات، چەند جارێک دەستی بە سەروچاویدا هێنا و سەیرێکی منی کرد. وتم:

_ئەم سەربازە چی دەڵێ و چی دەوێ بەم شەوە.

من وای بۆ دەچووم ئەویش وەک ئێمە ڕێگەی لێتێکچووبێت، دەنا بۆچ دەهاتە نێو ئەم مزگەوتە.

خەسرەو بە تەواوی گوێی شل کردبوو، پاشان ڕووی تێکردم، وتی:

_ با هەموو پێشمەرگەکان خەبەر بکەینەوە.

منیش بێسەبرانە وتم:

_ بۆ؟.

لە وەڵامدا وتی:

_ ئەم ئەفسەرە دەڵێ چوار دەورتان گیراوە بە سەربازی ئێرانی و ئێوە کێن و بۆ چەکدارن.

لە مشتومڕی ئێمە، زۆربەی پێشمەرگەکان، خەبەریان بووەوە. ئەوانیش نەیاندەزانی چی ڕوودەدات. بڕوام وایە کەسیش لە وتەکانی ئێمە تێنەدەگەیشت.

کابرای ئەفسەر وەک ڕاگەیەندراوێکمان بۆ بخوێنێتەوە، هەر بەردەوام بوو لە سەر قسە کردنی.

خەسرەو پوختەی قسەکانی بۆ وەرگێڕام و وتی:

_ دەڵێ بە خێر بێن بۆ خاکی شاهەنشاهی ئێران، ئێرە ئێرانەو پێویستە چەک دابنێن.

ئەمەی بە دەنگی بەرز وت و بەڕادەیەک هەموو پێشمەرگەکان لە بارودۆخەکە گەیشتن.

هەر بۆیە بوو بە وتوویژ لەناو خۆماندا و دەنگی ناڕەزایی بەرزبووەوە کە ئێمە بە هیچ جۆرێک چەک دانانێین و ئێمە نەهاتووین بۆ شەڕ.

خەسرەو کرۆکی قسەکانی ئێمەی بە فارسی بۆ ئەفسەرەکە وەرگێڕا.

دانانی چەک لای پێشمەرگە واتای تەسلیم بوونە کە کەسمان قبووڵی ئەو نەنگییەمان نەدەکرد. جارێکی تر بە خەسرەوم وت کە بەو ئەفسەرە بڵێ ئێمە هیچ کارێکمان بە ئێران نییە و تەنها بە ناچاری خۆمان کردووە بە نێو خاکی ئەواندا و هەر رۆژ بێتەوە، وڵاتیان بە جێ دەهێڵین.

ئەوەی لام جێی سەرنج بوو، ئەفسەرەکە زۆر بە باشی گوێی بۆ شل دەکردین، بەڵام ئەو هەر قسەکانی خۆی دووپات دەکردەوە کە دەبێ گەر دەمانەوێ لە خاکی ئێراندا بین، ئەوا دەبێ چەکەکانمان تەسلیمی ئەوان بکەین.

پێشمەرگەکان هەریەکەو پەلاماری چەکەکەی خۆی داو خۆی بۆ شەڕ ئامادە دەکرد کەمێ بۆ هێور کردنەوەی ئەوان وتم:

___ئەو پیاوەی قسەمان بۆ دەکات، سەیر کەن بێ چەکە ، پاشان ئەو پەیامی سەرووی خۆی دەگەیەنێت بە ئێمە.

ئەوەی لام سەیر بوو، ئەفسەرەکە هیچ لە کاردانەوەی ئێمە خۆی تێک

نەدەدا، ئەو هەر قسەی خۆی دەکرد و دەیویست بارودۆخەکە هێور بکاتەوە، چونکە چەند جارێک بە خێرهاتنی ئێمەی بۆ نێو خاکی ئێران دووپات دەکردەوە.

مامۆستا عەزیز هاتە تەنیشتمەوەو لێی پرسیم:

ـ ئەم سەربازە چی دەوێ لێمان؟.

لەوەڵامدا یەکسەر وتم:

ـ سەرباز نییە و ئەفسەرە، بەخێرهاتنمان دەکات، بە ناوی شاهەنشاوە بۆ ناو خاکی ئێران.

لە وەڵامدا زۆر بە جددی وتی:

ـ ئێمەش سوپاسی دەکەین، بەڵام بەراستی چی دەوێ؟

خەسرەو وەڵامی دایەوەو وتی:

ـ بە کورتی دەڵێ چەکەکانتان تەسلیمی ئەوان بکەن.

لە باتی مامۆستا عەزیز پێشمەرگەکان بە دەنگی بەرز وەڵامیان دایەوەو وتیان:

ـ مەگەر هەموومان بکوژن، دەنا ئێمە چەک بۆ کەس دانانێین.

خەسرەو هەڵوێستی پێشمەرگەکانی بۆ ئەفسەرەکە روون کردەوە، بەڵام ئەو هەر لە سەر هێمنی و هێوری خۆی بەردەوام بوو. چەندین جاری تر بە خێرهاتنی کردینەوە و دوایین جار وتی:

ـ ئەمە پەیامی سەروو خۆمە، پەیامی جەنابی سەرهەنگ، پەیامی

دەوڵەتی ئێران.

خەسرەو چووە نزیک ئەفسەرەکەو دووبەدوو کەوتنە وتووێژ، دیار بوو ئەویش لای خۆیەوە دەیویست وتەی پێشمەرگەکان وەک پەیامێک بگەیەنێت، بەڵام بە هێمنی.

ئەفسەرەکە چووە دەرەوە. کە خەسرەو هاتەوە لام وتی:

ـ بەراستی تووش بووین.

مامۆستا عەزیز زۆر بە پەلە وتی:

ـ بۆ؟

پرسیارێکی سادەو ساکار بوو. ئێمە پێشمەرگەین، چەکدارین، بە چەکەوە هاتووینەتە نێو خاکی وڵاتێکی تر و ئەوانیش بەمەیان زانیوە.

خەسرەو بە ئەسپایی پێی وتم:

ـ دەورمان گیراوە.

نازانم پێشمەرگەکان چۆن گوێیان لەوە بوو، چونکە پێکڕا وتیان:

ـ تا مردن شەڕ دەکەین.

***

## ٣٥

له نێو خۆماندا کەوتینە وتووێژ، بڕیاری هەموو ئەوە بوو کە بە هیچ جۆرێک چەک دانەنێین. حەماسەتی شۆڕشگێڕی هەموومانی گرتبووەوە. هەموو ئەو داوایەی بە ئیهانە دەزانی. له ڕاستیدا ئێمە بە خۆشی خۆمان نە هاتبووینە نێو ئێرانەوە. ئەوە ناچاری بوو.

بە سەر پەنجەرەی مزگەوتەکاندا. کە سێ پەنجەرەی گەورە بوون، پێشمەرگەمان دابەش کرد. هەر هەموو چەکەکانمان هێنایە سەر پێ و لە ئامادەباشیدا بووین. مامۆستا عەزیز هاتە تەنیشتمەوە، وەک ئێمە گڕی نەگرتبوو، هێمن دەهاتە پێش چاو ، وتی:

ـ با خەسرەو بانگ بکەین، ئەو فارسی دەزانێ، با هەوڵێک بدەین، بە ئاشتی لەم وەزعە قوتاربین.

خەسرەو خۆی گوێی لە قسەکانمان بوو، چونکە هێندە دوور نەبوو لێمانەوە. یەکسەر وتی:

ـ تا ڕۆژ نەبێتەوە هیچ ناکرێ.

حاجیش بۆ وتوویژ خۆی نزیک کردەوە، خەسرەو وتی:

_ بە پێشمەرگەکان بڵێ لە خۆیانەوە تەقە نەکەن.

ئێمە بەیانی لە هەوڵەکانمان بەردەوام دەبین.

راستی دەکرد، تازە بەو شەوە درەنگە هیچ نەدەکرا، لەگەڵ ئەوەشدا حاجی وتی:

_ زۆر باشە، بەڵام با هەر ئامادە باش بن.

حاجی کەوتە قسە لەگەڵ پێشمەرگەکان و وەک بڕیارێکی سەربازی رابگەیەنێت، وتی:

_ تەنها لە کاتی پێویست و بۆ داکۆکی تەقە دەکەن، دەنا تەنها وریاو بە ئاگا بن.

ئێمە خاوەنی چەکی سووک بووین، لە کلاشینکۆف زیاترمان پێنەبوو، ئەوانیش سوپای دەوڵەتێک بوون. ئێمە تەنها ٣٠ پێشمەرگە بووین. ئەوان خاوەنی هەزاران بوون. دەبوو زۆر بە وردی هەڵسوکەوت لەگەڵ بارودۆخەکە بکەین. ئێمە لایەنی لاواز بووین، ئەوە بەڵگەیەکی حاشاهەڵنەگر بوو.

هەموو چاوەڕێی رۆژبوونەوەمان دەکرد، بەو تاریکییە لە هیچ حاڵی نەدەبووین، چونکە کە لە پەنجەرەکانەوە سەیری دەرەوەمان دەکرد تەنها تاریکی بوو و هیچی ترنەدەبینرا.

ئەو چەند کاتژمێرەی تا دنیا رووناک بووەوە، لێمان نەدەڕۆیشت. لە چاوەڕوانیدا لەوە دەچێ زەمەن درێژ ببێتەوە و کاتیش، هەر ناڕوات.

لە ناکاودا، کابرایەکی بێ چەک ، خۆی کرد بە ژووردا، هەر زوو خۆی پێشکەش کرد و بە دەنگێکی بەرز وتی:

_ هاتووم بانگ بدەم.

بانگ؟ ئەمەم وا بە سەرسوڕمانەوە وت کە سەرنجی هەموو لایەکی ڕاکێشا. حاجی مەحموود وەک توانجم تێبگرێ وتی:

_ ئەی بۆ نازانی ئێرە مزگەوتە!.

ڕاستە، دەمزانی ئەوە مزگەوتە، بەڵام خەیاڵم بۆ ئەوە نەدەچوو کە بەم شەوە درەنگە کەسێک بانگ بدات.

مامۆستا عەزیز خەریک بوو نەهێڵێ کابرا بانگ بدات و وتی:

_ بێقەزابی کەی وەختی بانگە ئێستا ، نابینی دەورمان سەربازە!.

حاجی لە وەڵامدا وتی:

_ لێگەڕێ با مامۆستا بانگی خۆی بدات. بڕوا ناکەم کەس ئەمڕۆ بێت نوێژ بکات !.

کابرا هیچ گوێی نەدایە قسەی ئێمە، ئەو بانگی خۆی دا، بە بێ بڵندگۆ، نازانم کەس گوێی لێ بوو، یان نا. ئەوەی ڕاستی بێت کەس بە دەنگ بانگەکەوە نەهات. نازانم کەس گوێی لە بانگەکە نەبوو ، یان سەربازەکانی دەورووبەری مزگەوت، نەیاندەهێشت کەس بەرەو مزگەوت بڕوات.

کە بۆ دواجار لە پەنجەرەکەوە سەیرم کرد، دەورووبەر وردەوردە ڕووناک دەبۆوە، ئینجا بە تەواوی سەربازەکان و ئابلۆقەکەمان بە دی کرد.

هەموو سەربان و بن بانی ماڵەکانی دەورووبەرمان بە سەرباز تەنرابوو ، هەموو رووی چەکەکانیان کە هەندێکیان لە بی. کەی . سی دەچوون، روویان لە مزگەوتەکە کردبوو. چەند تانکێک لە دەورووبەر دەبینرا. نازانم ئێمە چۆن لە دەنگی ئەو(تانک)انە بە خەبەر نەهاتبووینەوە. هێند هیلاک بووین؟.

لەراستیدا، هەموو لەو راستییە گەیشتین کە ئێمە ئابلۆقەیەکی مەحکەم دراوین، کە دەرباز بوون لێی مەحاڵ بوو.

خەسرەو دوای ئەوەی لە سەیری ئەو دیو پەنجەرەکان بووەوە وتی:

_ چار هەر وتووێژە، شەڕ لەگەڵ ئەم هەموو سەربازە، بەو چەکە قورسانەوە، لە مەحاڵ زیاترە.

کە دنیا تەواو رووناک بووەوە، جارێکیتر ئەفسەرەکە هاتەوە ژووریّ، بیّ چەکو تەنانەت بە روویەکی خۆشەوە،وەک قسەکانی دوێنیّ شەو دووپات بکاتەوە، پێی وتین:

_ بەخێر بێن بۆ ئێران، بەڵام لێرە، جگە لە سەرباز ، ریّ بە کەس نادریّ چەکی لە شان بێت.

زۆری تری قسە بۆ کردین. خەسرەو هەر خەریکی وەرگێڕان بوو، ئێمە هەر هەوڵمان دەدا کە مەسەلەکە بە شێوەیەکی ئاشتیانە چارەسەر بکەین. هەر ئەوەمان دووپات دەکردەوە کە ئێمە بە هەڵە هاتووینەتە خاکی ئێرانەوە.

خەسرەو هاتەوە لام و وتی:

_ دەڵێی چی بچمە دەریّ و قسە لەگەڵ بەرپرسەکەیان بکەم .

دیارە ئەم ئەفسەرە هەر ئەو پەیامەی پێیە. ئێمە دەبێ قسە لەگەڵ گەورەکەیان بکەین.

هەموو رازی بووین. بۆیە یەکسەر ئاگاداری ئەفسەرەکەی کرد و ئەویش سەری رەزامەندی لەقاندو وتی:

_ دەچم پرسیار دەکەم و وەڵامتان بۆ دەهێنمەوە.

کە ئەفسەرەکە چووە دەرەوە، هەموو لە دەوری خەسرەو گردبووینەوە. پاش وتووێژێکی دوورو درێژ، بڕیار درا کە خەسرەو پەیامی ئێمە بگەیێنێ کە بریتی بوو لەوەی ئەوان مۆڵەتمان بدەن، بە چەکەوە، خاکی ئێران بەجێبهێڵین و کێشەکە کۆتایی پێبێت.

هەموو چاوەڕێی وەڵامی ئەفسەرەکە بووین. ئەوەندەی نەبرد، کابرای ئەفسەر بە دەنگی بەرز هاواری کرد و وتی:

_ ئەو برادەرەی کە فارسی دەزانێ با بێتە دەرێ، جەنابی سەرهەنگ بانگی دەکات.

خەسرەو بەبێ چەک لەگەڵ ئەفسەرەکە چووە دەرێ.

تەمەننای سەرکەوتنمان بۆ دەخواست.

***

## ٣٦

هەموو چاوەڕوان بووین، دەمانویست بزانین خەسرەو لەگەڵ ئێرانییەکان چیمان بۆ دەکات. وتوویژی نێوانمان زیاتر لە سەر ئەوە بوو کە نابێت بە هیچ جۆرێک چەک دابنێین، بەڵام دەبوو ئەو راستییەش بزانین کە ئێمە بۆ شەڕ نەهاتووینەتە نێو ئێران. ئەوان دەوڵەتن و سنووری دیاریکراوو یاساو رێسای تایبەتی خۆیان هەیە. راستە ئێمە مەبەستمان نەبوو بێینە نێو خاکی ئەوان، بەڵام ئەوە لە یاسادا ناخوات. ئێمە بێ رەزامەندی ئەو وڵاتە هاتبووینە نێو خاکیانەوە، سەرەڕای ئەوەش بەچەکەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا، هەموو خوازیاری ئەوە بووین کە کێشەکە بە گفتوگۆ تەواو بێت و ئێمە بگەڕێینەوە بۆ دیوی خۆمان.

سەرنجم دایە مامۆستا عەزیز، کەمێک لە ئێمە زیاتر نیگەرانی پێوە دیاربوو، لێم نەپرسی، کاتی ئەوە نەبوو، هەرچەند حەزم دەکرد، لەو نیگەرانییەی بگەم، بەڵام دامنا بۆ کاتێکی گونجاو.

لە ناکاو خەسرەو خۆی کردەوە بەژووردا، هەموو خێرا لە دەوری گردبووینەوەو تامەزرۆی دوا هەواڵ بووین. خەسرەو وتی لەگەڵ

بەرپرسی سەربازیی کە پلەی سەرهەنگ بوو، دانیشتووە، بە گشتی هۆکاری هاتنە ناوەوەی ئێرانی بۆ روون کردوونەتەوە، کە مەسەلەکە لە بنەڕەتدا رێگە لێتێکچوون بووە، دەنا ئێمە بە هیچ جۆرێک نیازی نێو ئێرانمان نەبووە. مامۆستا عەزیز لە پرسیارێکدا وتی:

_ خۆ نەت وت بە نێو ئێراندا هاتووین؟

خەسرەو وەکو بەو پرسیارە خۆشحاڵ نەبووبێت وتی:

_ چۆن شتی وا دەڵێم. من وتم، شەو لە سەر سنووری خۆمان، رێگەمان هەڵە کردووە. چۆن باسی شتی وا دەکرێ.

دیار بوو کەمێک پەستی دایگرت، هەرچەند پرسیارەکەی مامۆستا عەزیز لە دڵپاکییەوە بوو.

خەسرەو زیاتر لە سەری رۆیشت و وتی:

_ ئێرانییەکان دەڵێن، مادام ئێوە هاتوونەتە نێو ئێران و وەک خۆتان دەڵێن، بێ مەبەست، ئیدی دەبێ چەکەکانتان دابنێن تا کێشەکەتان چارەسەر دەبێ.

حاجی مەحموود یەکسەر وتی:

_ باشە چۆن چارەسەر دەبێ؟

لەوەڵامیدا بەپەلە وتی:

_ ئەوان دەڵێن پێوەندییان کردووە بە تارانەوەو چاوەڕێی بڕیاری ئەوانن.

حاجی بەردەوام بوو و وتی:

_ ئەی تا ئەوکاتە؟

خەسرەو وتی:

_ دەڵێن تا ئەو کاتە چەکەکانتان لە سووچێکی مزگەوتەکەدا دابنێن و خۆتان پاسەوانی بکەن تا بڕیارمان بۆ دێت.

لە راستیدا بڕیارێکی سەیر بوو، ئەوان دەیانویست چەک دابنێین، بەڵام چەکەکانیش هەر لای خۆمان بێت. ئەمە تۆزێک بۆ ئێمە ئاڵۆز بوو، پێشمەرگەکان کەوتنە پرسیاری ئەوەی کە ئەوان لە مەبەستی ئێرانییەکان تێناگەن.

خەسرەو هەر بۆ زیاتر روونکردنەوە وتی:

_ بۆ ئەوەی ئەمان بە سەرووی خۆیان بڵێن چەک دانراوە، بۆ ئەوان ئەوە گرنگ بوو کە ئاگاداری سەرووی خۆیان بکەن.

لە نێو خۆماندا کەوتینە گفتوگۆ. هەبوو دەیوت مادام چەکەکان لای خۆمانەو هەر لەم ژوورەدایە ئیدی بۆ بە چەککردن حساب بکرێ.

خەسرەو لە کۆتایی قسەکانیدا وتی:

_ ئەوان ئامادەن کە دوو چەک لای خۆمان بمێنێ بۆ پارێزگاری لە چەکەکانمان.

دیارە مەبەستیان ئەوە بوو کە دڵنیامان بکەن کە ئەوان نیازی خراپەیان نییە بەرانبەرمان.

لە پرسیاری ئەوەی کە ئەو دوو چەکە بە کێ دەبێ ، لە وەڵامدا وتی:

_ یەکێکیان بە خۆم و ئەوی دیش...

ئیشارەتی بۆ من کرد؛

ـ بەو دەبێ.

من خۆشم سەرم سوڕما، هۆکار چی بوو کە خەسرەو لە ناو هەموو پێشمەرگەکاندا، منی هەڵبژارد،وتی:

ـ دوایی پێت دەڵێم.

پێشمەرگەیەک بە دەنگی بەرز وتی:

ـ ئەی ئەگەر بڕیاری سوپامان رەفز کرد؟

پرسیارێکی بە جێ بوو، هەموو چاوەڕێی خەسرەو بووین، ئەویش چاوی بە نێو هەمووماندا گێڕاو وتی:

ـ ئێمە ئێستا ئابلۆقە دراوین لە هەر چوار لاوە. ئەم ئابلۆقەیە هەر بەردەوام دەبێ. ئەوان وتیان کە ناهێڵن کەسیش تەنانەت بۆ سەر ئاودەست بچێت.

لەراستیدا هەڵوێستی ئێمە ئیدی هێند بە هێز نەبوو، تا چەند دەمانتوانی بێ خواردن بین. ئەی ئاو دەست؟ وەک ئەوەی تازە بیرمان بکەوێتەوە کە یەکێک لە پێویستییەکانی ژیانی رۆژانە ، ئاودەست بوو، کە ئەویش دەکەوتە ژێر کۆنترۆڵی سەربازەکانەوە. ئاودەستەکان لە ئێمەوە دوور بوون بۆیە ئێمە نەماندەتوانی سوودی لێوەرگرین، ئەمە لەگەڵ ئەوەی کە سەربازەکان هەموو لە دەرەوە لە ئامادەباشیدا بوون و بە هیچ جۆرێک مۆڵەتی چوونە دەرەوەیان نەدەدا، بۆیە ئیدی بە جیددی کەوتینە وتوویژ لە سەر پێشنیارەکانی سوپا.

ئێمە تا چەند دەمانتوانی، بێ نان و ئاو و بێ بەکارهێنانی ئاودەست، بەردەوام بین. خاڵێکی زۆر لاوازی ئێمە بوو، بۆیە دەبوو بە جۆرێکی تر بیر لە داهاتوو بکەینەوە.

پاش مشتومڕێکی دوورو درێژ، هەموو گەیشتینە ئەو قەناعەتەی، بە راسپاردەکانی ئەوان رازی بین. لەوە زیاتر چیمان پێدەکرا؟

پاش ئەو وتووێژە خەسرەو وتی:

_ کەواتە دەبێ ئێستا بچمەوەو بڕیاری خۆمانیان پێبگەیێنم.

خەسرەو چووە دەرێ. سەرنجی ناو پێشمەرگەکانم دا، شێخ سدیق بێدەنگ دانیشتبوو، هیچ بەشدارییەکی لە قسەکانماندا نەکرد، وا بزانم گوێی لە زۆربەی قسەکانمان هەر نەبوو، یان خەیاڵی هەر لای ئاژەڵەکەی بوو.

تا ئەو ساتەی خەسرەو باسی ئاودەستی نەکردبوو، من هیچ هەستم بە تەنگاوی نەدەکرد بەڵام ئێستا، ئیدی پەرێشان بووم.

مامۆستا عەزیز کە هەر سەیری منی بە وردی دەکرد، لەوە دەچوو هەستی بە ئاڵۆزیم کردبێ ، وتی:

_ تۆ بڵێی بهێڵن سەردانی ئاودەست بکەین.

تەنها سەرم بۆ بادا، نازانم تێدەگەیشت چی دەڵێم یان نا .

***

## ٣٧

ئێمە لەنێو خۆماندا، خەریکی هەڵسەنگاندنی پێشنیارەکانی سوپای ئێران بووین. هەندێک هەر بە گومانەوە لەو داوانەیان دەڕوانی، بەڵام چار چی بوو. ئێمە تەواو ئابلۆقە درا بووین و لە بەرگرییەکی نەرێنی دا بووین، چونکە گەر ببوایە بە شەڕ، ئیدی بە هیچ جۆرێک مۆڵەتی دەربازبوونمان بۆ نەدەما، بۆیە هەوڵی زۆرینە هەر ئەوە بوو، کە هەر چۆنێک بێت نەهێڵین مەسەلەکە بگاتە شەڕ.

تا لای نیوەڕۆ هەر چاوەڕێ بووین و تا رادەیەکیش کەوتینە گومانەوە. مامۆستا عەزیز لێم نزیک بووەوەو وتی:

_ تۆ بڵێی نەیانگرتبێت.

هیچ وەڵامێکم لا نەبوو، بۆیە وتم:

_چاکتر وایە چاوەڕێ بین.

لە سەر دواکەوتنی گەڕانەوەی خەسرەو هەر کەسەو قسەیەکی دەکرد، یەکێک وتی:

_ کێ دەڵێ نەیانبردووە بۆتاران !

ئێمە مێژوویەکی بێ متمانەییمان، لەگەڵ ئێراندا، هەیە بۆیە وتەکانی ئەو برادەرە جێی رامان بوو، راستی دەکرد. ئەمانە لە کاتی وتووێژدا هەمیشە فرسەتیان لێهێناوین، ئەوە سمکۆ، ئەوە پێشەوا .

ئێمە لە تاووتوێی مەسەلەکەدا بووین، کە لە ناکاو خەسرەوو ئەفسەرە ئێرانییەکە خۆیان کرد بە ژوورا.

ئەفسەرەکە کەوتە ئاخاوتن بۆمان، دیارە دەیویست دوا بڕیارمان پێبگەیەنێت. خەسرەو وتەکانی بۆ تەرجومە دەکردین. ئەفسەرەکە وەک لە سەر قسەکانی پێشووی بەردەوام بێت وتی:

_ ئێوە ئێستا میوانی ئێمەن.

مامۆستا عەزیز لە پەناوە بە ئەسپایی وتی:

_ بە راستی میوانداری هەر وا دەبێت.

بە کورتی ئەفسەرەکە دەیوت کە دەبێ چەکەکان لە سووچێکی ژوورەکەدا دابنێن و تەنها دوو چەک لای ئێمە بێ و خۆمان پارێزگاری چەکەکان بکەین تا بڕیاری سەرو خۆیان بۆ دێت. ئەوەش هەر قسەکانی پێشووی خەسرەو بوو.

لە راستیدا ئێمە چارمان لەوە زیاتر نەبوو، یان دەبوو بۆ شەڕێکی نابەرامبەر و ناسەرکەوتوو مل بنێین، یان پێشنیاری ئێرانییەکان قبووڵ بکەین. ئەفسەرەکە زۆری لە سەر رۆیشت و دەیوت ئەمە چەک کردن نییە و با بە هەڵە تێنەگەین. ئەو دەیوت ئەمە چەک دانانێکی کاتییە تا لە ئێران دەچینە دەرێ. ئەفسەرەکە هەر بۆ دڵنیا کردنمان وتی:

_ ئەوانە هەموو چەكی خۆتانن و كەی بڕیار هات هەموویان دەدەینەوە، بەڵام لە سەر سنوور.

ئیدی پێویستی بە وتووێژی زیاتر نەدەكرد، بۆیە هەموو چەكەكان لە سووچێكی ژوورەكەدا دانرا و تەنها دوو چەك مایەوە كە یەكێكیان درا بە من.

پاش ئەوەی ئەفسەرەكە لەوە دڵنیا بوو ، وتی:

كێ كاری سەر ئاوی هەیە با بفەرموێ.

من یەكەم كەس بووم كە دەستم هەڵبڕی، لە ڕاستیدا دەمویست بەو هۆیەوە دەرەوەی مزگەوتەكە ببینم و لە بارودۆخەكە بگەم.

ئەوەی دەیویست، سەربازێكیان لەگەڵ دەنارد. خەسرەو لامەوە دانیشت، زۆر ئاڵۆز دەهاتە پێش چاو. لە پرسیاری ئەوەی بۆ لەناو هەموو پێشمەرگەكاندا منی بۆ پاسەوانی چەكەكان لەگەڵ خۆیدا هەڵبژارد وتی:

_ لە ڕێگە زۆر باسی زیندانت بۆ كردم ، كە چۆن ڕووبەڕووی مەرگ بوویتەوە و ورەت بەرنەداوە و پاشان هەڵاتووی. بۆیە كەسێك وا لە مەرگ نزیكبۆتەوە لە مانای ژیان دەگات و هەڵەشەیی ناكات.

من لای خۆمەوە سوپاسم كرد. سەیرم كرد زوو زوو خەیاڵی دەڕوات ، بۆیە جارێكیتر پرسیارم كردەوە و وتم:

_ كەمێك نیگەران دێیتە بەرچاوم، خێرە؟

سەیری ئەملاوئەولای خۆی كرد و وتی:

سەرهەنگەکە گومان لە من دەکات. دەیوت گوایە من ئێرانیم، دەنا چۆن وا چاک فارسی دەزانم. هەرچەند من پێم وت کە لە زانستگای بەغدا ئەدەبیاتی ئێران و زمانی فارسیم خوێندووە، بەڵام ئەو بڕوای بە قسەکانم نەدەکرد.

پاش کەمێک بەردەوام بوو، سەری هێنایە بن گوێمەوەو وتی:

_ هەندێ پێناسەم پێیە، لە سووریاوە بۆیان ناردووم، بە ناوی خوازراوەوەو بە عەرەبیشە، گەر ئەوانەم پێ بگیرێ ئەوا هەموومان بە یەکجاری تووش دەبین.

بێ سێ و دوو وتم:

_ بیدە بە من، بۆت چارەسەر دەکەم.

دیار بوو دەیویست بە زووترین کات لە دەست ئەو بەڵگانە رزگاری بێت ، بۆیە یەکسەر پێناسەکانی دا بە من و منیش خستمە باخەڵمەوە.

لە پرسیاری ئەوەی کەچی لێدەکەم ، بە ئەسپایی پێم وت:

_ ئێستا بە ناوی سەرئاوەوە دەچمە دەرێ و لەوێ چاری دەکەم.

من وام دانا کە گەر بچمە دەرێ ئیدی دەتوانم لە شوێنێک فرێی بدەم، هەرواشم کرد، کاتی مۆڵەتی سەرئاوی بۆ وەرگرتم و چوومە دەرێ، بێ سێ و دوو فرمدایە نێو ئاودەستی مزگەوتەکەوە.

کە گەڕامەوە بە چاوی پرسیارەوە تێی دەڕوانیم بۆیە یەکسەر وتم:

_ ئاسوودە بە ، لە ناوم بردن.

مامۆستا عەزیز ئاگای لە وتووێژو پێناسەکان بوو، چونکە ئەویش وتی:

_ منیش پاسپۆرتێکی عێراقیم پێیە و ڤیزەی سووریاشی لە سەرە.

بەڕاستی ئەوە، گەر بگیرایە، زیاتر گومانی دەخستە سەرمان ، بۆیە وتی:

_ بە ڕای تۆ چی لێبکەم؟

_ زۆپای مزگەوتەکە دەسووتا، پەلی مامۆستا عەزیزم گرت، بە ناوی خۆ گەرم کردنەوە لێی نزیکبووینەوە، وتم:

_ ئێستا من دەرکی زۆپاکەت بۆ دەکەمەوە و تۆش هەر خێرا پاسپۆرتەکە فڕێدەرە نێوی.

لە چاوترووکانێکدا، کارەکەی ئەنجامدا، ئیدی ئاسوودە دەهاتە پێش چاو.

خەسرەو بە تەنها چووە شوێنی میحرابی مزگەوتەکە، لەوە دەچوو حەز بکات بە تەنها بێت. دیار بوو لە بیرکردنەوەدا بوو، چوومە نزیکییەوە. وەکو باسێکی پچڕاوم بۆ تەواو بکات وتی:

_ گەر ئەمانە بزانن ، من دوو ساڵ لە ئێران بووم و سەفەری دەرەوەی ئێرانم بە نهێنی کردووە، ئێوەش بە هۆی منەوە تووشی دەردەسەرەی دەبن.

پاشان کەوتە باسی گەشتە نهێنییەکانی بۆ تورکیا و سووریا و باسی پێوەندییەکانی خۆی بۆ کردم. من بە تەواوی گوێم بۆ قسەکانی شل

کردبوو، خەسرەو وەک قسە لەگەڵ خۆیدا بکات وتی:

_ ئەم سەرهەنگە وا دەزانێ من ئێرانیم و پەیوەندیم بە گرووپەکانی دژ بە شاوە هەیە.

من هەر بۆ دڵنیاکردنەوەی وتم:

_ هێند رەشبین مە بە.

ئەو سەری با داو وتی:

_ ئەوانە گومانم لێدەکەن.

ئەمەی وت و لە شوێنی خۆی راکشا.

*** 

## ٣٨

لای ئێوارە چوومەوە لای خەسرەو، لە خەو هەستابوو، بەڵام هەر شەکەت دەهاتە پێش چاو. کەوتینە ئاخاوتن، ئەو هەر ئەوەی دووپات دەکردەوە کە ئێرانییەکان بە گومانەوە تێیدەڕوانن، منیش هەر بۆ دڵنیاکردنی وتم:

ـ ئەوان، چونکە ئێمە هەموو چەکدارین، گومان لە هەموومان دەکەن.

پاشان وتم:

ـ پێشمەرگەیەکی خەڵکی مەهابادیشمان لەگەڵدایە، ئەویش ترسی ئاشکرابوونی هەیە.

لەو یەک دوو ڕۆژەدا ، هەموو پێشمەرگەکانم ناسی، فرسەتێکی چاک بوو، چونکە تا ئەوکاتە مۆڵەتی وامان بۆ نەڕەخسابوو کە ئاوا پێکەوە دابنیشین و لە نزیکەوە یەکتر بناسین.

من باسی ئەو پێشمەرگەیەم بۆ کرد کە خۆی وەک عەلی مەهابادی ناساند و وتی کە هەر لە سەرەتای دەستپێکردنی شۆڕشی نوێوە،

ئەویش هاتۆتە دیوی خۆمان، چونکە کاتی خۆی پێشمەرگەی ئەیلوول بووە. ئەو شەوە زۆر پێکەوە قسەمان کرد، مامۆستا عەزیز و حاجی مەحموود و لەمەودواش عەلی مەهابادی هاتنە نزیکمانەوە. خەسرەو هیچ نیگەرانی خۆی لای ئەوان باس نەکرد و لە باتی باسی ژیانی پێشووی خۆی بۆ کردین کە لە خانوادەیەکی هەژارە و باوکی کرێکارێکی رۆژانە بووە لە شارۆچکەی خانەقین. ئەو زۆر باسی سەختی ژیانی خۆی بۆ کردین کە چۆن ئەویش ناچار بووە رۆژانە ، پاش دەوامی قوتابخانە کە لە چاخانەیەک شاگردی بکات و واز لە خوێندن نەهێنێ و پاشان بشبێتە مامۆستا لە یەکێ لە گوندەکانی نزیک شارەکەیان. زۆر باسی زوڵم و زۆری حکوومەتی بەعس و بەعسییەکانی بۆ کردین کە چۆن بە تایبەتی لەوناوچانە دەیەوێ کورد دەرپەڕێنێ و عەرەب نیشتەجێ بکات. باسی ئەوەشی بۆ کردین کە ئەو لە سەرەتای حەفتاکاندا، فەرمانی گرتنی بۆ دەرچووە و ئیدی ناچار بووە ببێتە پێشمەرگە. بەڵام نسکۆی شۆڕش لە حەفتاو پێنج دا، سەراپای ژیانی گۆڕیوە و بە ناچاری رووی کردۆتە ئێران و لەوێ بووە بە پەنابەر و بە کرێکاری بژێوی خۆی پەیدا کردووە.

بەڵام نوێبوونەوەی شۆڕش هیوای لا پەیدا کردۆتەوە و پێوەندی بە رێکخستنە نهێنییەکانەوە کردووە تا ئەو رۆژەی لە ئێران هەڵاتووە و بووە بە پێشمەرگە.

عەلی مەهابادی زۆر بە وردی گوێی دەگرت، ئەویش وەک باسی سەرگوزەشتەی ژیانی بگێڕێتەوە وتی:

_ داستانی منیش نزیکە لە کاکە خەسرەو، بەڵام من جوتیار بووم و زوڵم و زۆری نە ئاغا و نە ئەوانم_ ئیشارەتم بۆ ئەو دیو دەکرد دیارە مەبەستی سوپا بوو_ پێ قبووڵ دەکرا ، بۆیە منیش هەر لە

ناوەڕاستی شەستەکانەوە چوومە ئەو دیو و بووم بە پێشمەرگە.

وەک تێبینییەک خەسرەو وتی:

_ بەڵام کاک عەلی دەبێ بە هیچ جۆرێک نەزانن کە خەڵکی ئەم دیویت، دەنا بە تەواوی لێمان دەقەومێت.

عەلی مەهابادی سەری بۆ لەقاندین وەک مرۆڤێکی کردە، وتی:

_ چۆن دەهێڵم بزانن.

حاجی مەحموود کە زۆر بە جددی گوێی بۆ وتووێژەکان شل کردبوو وتی:

_ وا چاکە ئیتر بە خۆت بڵێی عەلی ماوەتی، لە باتی مەهابادی.

پێشنیارێکی بەجێ بوو، بۆیە هەموو پشتیوانیمان کرد.

مامۆستا عەزیز لەگەڵ شێخ سدیق لە وتووێژێکی گەرمدا بوون. نازانم باسی چییان دەکرد و هەر بۆ بەشداری قسەکانیان و دروستکردنی بارودۆخێکی ئاسایی وتم:

_ قەت ناشێ باس هەر باسی وڵاخەکەی یاشێخ بێت.

شێخ سدیق بە چاوی سەرزەنشتەوە تێیدەڕوانیم، چونکە وتی:

_ کەمی خزمەت نەکردن.

تا درەنگانی شەو، پێکەوە دانیشتین، من سەرنجی سووچی مزگەوتەکەم دەدا کە چەکەکانی لێ هەڵچنرابوو و بیرم لە مەبەستی سوپا دەکردەوەو لە دڵی خۆمدا دەموت:

_ گەر ئەمانە نیازیان خراپ بوایە، بۆ دەیانهێشت ئەو چەکانە لای خۆمان بێت.

چار هەر چاوەڕوانی بوو، تازە ئێمە تووشی گرفتێک بووبووین و دەبوو ئاکامی هەرچۆنێک بێت تەحەمولی بکەین.

لە نزیک خەسرەوەوە لێی راکشام. خەوم نەدەهات، هەر تاووتوێی داهاتووم دەکرد. من لە نیگەرانییەکانی خەسرەو دەگەیشتم. ئەم رژێمانە گومان لە هەموو شتێک دەکەن، بە رواڵەت خۆیان بە شارستانی لە قەڵەم دەدەن، بەڵام بە کردار تا بڵێی دواکەوتوو و کۆنەپەرستن. خەسرەو بە ناچاری پەنای بردبووە بەر ئێران، دوای شکستی شۆڕش و ئێستاش کە شۆڕش دەستیپێکردۆتەوە ئەویش هاتووە بەشداری دەکات، ئەمە هیچ پێوەندییەکی بە ئێرانەوە نییە. ئەو نەهاتووە چەک دژی رژێمی ئێران هەڵبگرێ، ئەو هاتۆتەوە بۆ وڵاتی خۆی و لە سەر خەبات بەردەوام دەبێ. ئیتر ئەوە گومانی بۆ دەوێ!.

مامۆستا عەزیز دیار بوو ئەویش خەوی نەدەهات، بۆیە هاتە لای منەوەو وەک باسێکی پچڕاوم بۆ تەواو بکات وتی:

_ بۆ ئەو پاسپۆرتەم سووتاند، لە داهاتوودا هەر سوودێکی بۆم دەبوو.

لەوە دەچوو پەشیمان بێ، بەڵام تازە کار لەکار ترازابوو. بۆ پێشمەرگە پاسپۆرت چ سوودێکی دەبێ، بەتایبەتی بۆ کەسانێک کە لە شاخ و کێو ژیان بەسەر بەرێت، بەڵام هەر بۆ دڵنەوایی ئەو وتم:

_ کاتێ بە ئامانج دەگەین، ئاسانترین شت پاسپۆرتە، ئێستا با بیر لە چەکەکان و خۆمان بکەینەوە. چیمان بە سەر دێ..

ماموستا عەزیز پشتیوانی لە قسەکانم کرد، بەڵام وتی:

_ ئاخر نازانی، کاتی خۆی، بە چ دەردەسەرییەک ئەو پاسپۆرتەم چنگ کەوت.

لە عێراقی ژێر دەستی بەعس، سەختترین کار، بەدەستهێنانی پاسپۆرت بوو. رژێم دەیویست کەس نەچێتە دەرەوەی وڵات، هەمووی هەر لە نێو عێراقدا زیندانی بێت، بۆیە کاتێک کەسێک پاسپۆرتێکی چنگ دەکەوت بە دەستکەوتێکی گەورە لە قەڵەم دەدرا، چونکە بەهۆیەوە دەیتوانی لە دۆزەخی عێراق رزگار بێت.

ئێمە هەر خەریکی قسەکردن بووین کە گوێم لە خەسرەو بوو بەدەم خەوەوە دەیناڵاند و داوای دایکی دەکرد.

سەیری ماموستا عەزیزم کرد و بە ئەسپایی وتم:

_ با ئێمەش بنووین و خەوەکەی لێ تێک نەدەین.

***

## ٣٩

له غه‌ڵبه‌غه‌ڵبی نێو ژووره‌كه‌ به‌ئاگا هاتمه‌وه، پێشمه‌رگه‌كان تا راده‌یه‌ك ئاڵۆز و شڵه‌ژاو ده‌هاتنه‌ پێش چاو. له‌ پرسیاری هۆكاری ئه‌و شڵه‌ژانه‌ یه‌كێك له‌ پێشمه‌رگه‌كان وتی:

_ له‌ به‌یانی زووه‌وه‌ تێبینی ده‌كه‌ین كه‌ هێزی زیاتر ده‌وری مزگه‌وته‌كه‌ ده‌دات و جموجۆڵێكی نائاسایی هه‌ست پێده‌كرێت.

خه‌سره‌ویش به‌ خه‌به‌ر هاتبووه‌وه. كه‌وتینه‌ راوێژ، ئه‌و وتی:

_ دوور نییه‌ گۆڕینی سه‌ربازه‌كانیان بێت. بڕوا ناكه‌م له‌وه‌ زیاتر بێت، به‌ڵام با سه‌بر بكه‌ین.

هه‌موو له‌ ده‌وری زۆپاكه‌ گردبووینه‌وه، هه‌ریه‌كه‌و رای خۆی نیشانده‌دا، حاجی مه‌حموود سه‌یری خه‌سره‌وی كرد و وتی:

_ تۆ فارسی ده‌زانی بۆ پرسیاریان لێ ناكه‌یت و بزانین به‌ نیازی چین؟

ئه‌وه‌ نه‌ده‌گونجا، ئێمه‌ ئابڵۆقه‌ درا بووین و بۆ ئێمه‌ نه‌بوو پرسیاری له‌وجۆره‌ بكه‌ین، ئه‌وه‌ كاری سه‌ربازیی خۆیان بوو، بۆیه‌ خه‌سره‌و

وتی:

ـ ئێمه ناتوانین هیچ بڵێین و دەبێ چاوەڕێی ئەوان بین.

لەگەڵ ئەوەشدا کە ئابڵۆقەیەکی مەحکەم درابووین، بەڵام سێ ژەمە خواردنیان بۆ دەناردین، بۆیە کەس هەستی بە برسێتی و سەرماش نەدەکرد. لە راستیدا گەر ئێمە دووچاری ئەو بارودۆخە نەبووینایە و سوپا دەوری نەدابینایە، بۆ ئێمە پشوودانێکی بێوێنە بوو.

هەموو خەریکی بەرچایی خواردن بووین، هەستم کرد خەسرەو دەست نابات بۆ نانەکە، لە پرسیاری ئەوەی بۆ هیچ ناخوات وتی:

ـ لە راستیدا لە دوێنێ شەوەوە هەست دەکەم دڵم هیچ نابات.

هەر چەند زۆریشمان لێکرد، بەڵام ئەو هەر هیچی نەخوارد. من وای بۆ دەچووم کە رەنگ بێت مان لە نانخواردن بگرێت، یان بە نیازی ئەو هەوڵە بێت. ئەگەرچی هەریەک لە مامۆستا عەزیز و حاجی مەحموودیش زۆر هەوڵیان لەگەڵ دا بەڵام ئەو بە پاساوی ئەوەی دڵی هیچ نابات دەستی بۆ هیچ نەبرد.

هەموو لە تاووتوێی ئەوەدا بووین کە دەبێ چی روو بدات کە لە ناکاودا ئەفسەرەکە، کە هەمیشه هەر ئەو پەیامی پێڕادەگەیاندین هاتە ژوورێ بانگی خەسرەوی کرد.

خەسرەو سەیرێکی قووڵی کردم کە زۆر مانای دەبەخشی، سەرێکی لەقاند و وتی:

ـ بەڵێ.

لەگەڵ ئەفسەرەکە چووە دەرێ، ئیدی هەریەکەو شتێکی دەگوت و پێشبینییەکی دەکرد، مامۆستا عەزیز هەڵیدایەو وتی:

ـــ پێویست بەو هەموو رمڵ لێدانە ناکات. تۆزێکی تر دەگەڕێتەوەو هەموو شتێک دەزانین.

لەراستیدا من خۆم هێند رەشبین نەبووم، چونکە ئێمە هیچ کارێکمان دژی دەوڵەتی ئێران ئەنجام نەدابوو، رێ لێتێکچوونیش، بە تایبەتی لە کێوو لە نێو بەفردا، بە کارێکی ئاسایی دادەنرێ و ناکرێ بە تاوان حیساب بکرێ. ئەمە سەرەڕای ئەوەی ئێمە بە ئەفسەرەکەو بە لێپرسراوانی، دەیان جار دووپاتمان کردەوە کە ئێمە هیچ نیازێکی خراپمان نییە و مەسەلەکەش تەنها رێ هەڵە کردنە.

بەڵام ئایا ئەوانیش وەکو ئێمە بیریان دەکردەوە، ئەوانە سوپای دەوڵەتێک بوون، بەرەنگاری کۆمەڵێ چەکداری بە نیسبەت ئەوانەوە نایاسایی بوون کە هاتوونەتە نێو وڵاتەکەیان بە بێ مۆڵەت ، کە دیارە ئیدی ئەوان دەبوو بە جۆرێکیتر لە ئێمە بیر بکەنەوە.

ئێمە خەریکی وتووێژی نێو خۆمان بووین کە خەسرەو خۆی کردەوە بە ژووردا. ئەمجارە بە وردی سەرنجم دا، زیاتر نیگەران دەهاتە پێش چاو و تارادەیەکیش تووڕەیی لە سەروچاویدا دەبینرا و بە گشتی پەشۆکا بوو.

هەموو لە دەوری گردبووینەوەو گشتمان تامەزرۆی هەواڵ و وتووێژەکانی بووین.

ئەو زۆر لە سەر خۆ وتی:

ـــ ئەم هێزە تازەیەی کە هاتووە، لەگەڵ شاندێکی (ساواک) و (ئیتلاعات) هاتووە.

ئینجا کەوتە باسی ئەو دوو شوێنە کە یەکێکیان کە ساواکە، ئەوا بەرپرسی ئاسایشی ناوخۆی وڵاتەو ئەویتریشیان کە ئیتلاعاتە، رۆڵی

فەرمانگەی ئیستیخباراتی لای خۆمانی دەدی.

ئەو وتی، کە هەردوو دەستگاکە لە لایەن بەرپرسانیانەوە راسپێردراون کە لێکۆڵینەوە لەگەڵمان بکەن و هۆکاری هاتنمان بۆ نێو خاکی ئێران روون بکەینەوە.

خەسرەو زیاتر بەردەوام بوو و وتی:

_ رەنگە پاش ماوەیەکی تر یەکەیەکەمان بانگ بکەن بۆ لێپرسینەوە.

پاشان چاوی بە ناو هەمووماندا گێڕاو وتی:

_ بۆیە پێویستە کەس ناوی راستەقینەی خۆی نەڵێ و تا دەشتوانێ کەمترین زانیاری بدات.

شێخ سدیق کە زۆر هاتبووە پێشەوەو دەیویست بە باشی لە وتەکانی بگات وتی:

_ ئەی ناوی خۆمان نەڵێین، چی بڵێین.

مامۆستا عەزیز وەڵامی دایەوە و وتی:

_ مەبەستی ئەوەیە ناوەکەی خۆت بگۆڕە، بە ناوێکی تر.

شێخ سدیق بە سەرسوڕمانەوە تێیدەڕوانی ، بۆیە مامۆستا عەزیز وتی:

_ تۆ ئێستا شێخ سدیق نیت؟

ئەمیش یەکسەر وتی :

_ بێ گومان .

ئەویش زۆر بە جددی وتی:

ـــ دەبڵێ ... شێخ سادق و براپەوە.

هەر چەند کاتی پێکەنین نەبوو، بەڵام نەمانتوانی خۆمان رابگرین و لە ژێرەوە پێنەکەنین.

خەسرەو هیچ بەو نوکتەیە پێکەنینی نەهات. تفەنگەکەی هەڵگرت و چووە شوێنی میحراب و لەوێ بەتەنها لێی دانیشت.

هەر خێرا چوومەوە لای و لێم پرسی:

ـــ ئەی هیچی تریان نەوت؟

خەسرەو داوای جامێ ئاوی کرد، کە خواردیەوە سەیرێکی قووڵی کردم و وتی:

ـــ نەموت ئەمانە گومان لە من دەکەن.

هیچم نەوت ، لەراستیدا نەمدەزانی بڵێم چی؟

من هاتمەوە لای رۆپاکە و خەریکی دەستکەرمکردنەوە بووم، لە ناکاودا سەدای گوللەیەک هەموومانی شڵەژاند. کە ئاورم دایەوە خەسرەو بە پشتا دەکەوت...

***

## ٤٠

من یەکسەر بۆ لای خەسرەو ڕۆیشتم، بە پشتا کەوتبوو، خوێن لە سنگی دەهات، سەریم بەرز کردەوە، هێشتا مابوو، نەمدەزانی چی بکەین، کەسیشمان لەگەڵدا نەبوو کە شارەزایی، یان کەرەستەیەکی تەندروستی پێ بێت. من جامانەیەکم خستە سەر برینەکەی، هیچ سوودی نەبوو. پێشمەرگەکان هەموو لە دەوری گردبوونەوە، هەر کەسەو شتێکی دەوت.

ئێمە هەموو خەریکی خەسرەو بووین کە لە ناکاودا بە دەیان سەرباز بە چەکەوە خۆیان کرد بە ژووردا، سۆراخی تەقەکەیان دەکرد. ئەفسەرەکە هاتە پێشەوە ڕووی کردە لای خەسرەو، دیمەنەکە بۆخۆی دەدوا، پێویستی بە شرۆڤە نەدەکرد. داوای لێکردین کە خەسرەو هەڵگرین و بۆ دەرەوەی مزگەوتەکە ببەین. لە دەرەوە هەموو سەربازەکان بە ئامادەباشی ڕاوەستابوون و تفەنگەکانیان هێنابووە سەرپێ و بە چاوی گومانەوە تێیان دەڕوانین.

ئێمە خەسرەومان لە هەیوانی مزگەوتەکەدا پاڵخست. بەرپرسەکەیان کە هەموو سەرشانی ئەستێرە بوو هاتە پێشەوەو سەیرێکی کرد. هەر چۆنێک بوو تێمان گەیاند کە ئەو کارە خۆی کردوویەتی. من سەرم

بردە لای سەری خەسرەوەو وتم:

_ ئەمەت بۆ کرد!؟

چاوی بەرز کردەوەو بە نێوماندا دەیگێڕا، وتی:

_ لە بەر ئێوە...

ئەو لەو چەند ڕۆژەی پێشوودا، هەمیشە ئەوەی دووپات دەکردەوە کە ئێرانییەکان گومانی لێدەکەن، دیاربوو ئەو گومانە بە هاتنی ساواک و ئیتلاعات زیادی کردبوو، چونکە هەر دوای بینینی ئەوان ئەو کارەی ئەنجامدا. ئەو پێی دەوتم کە ئەم دوو دەزگایە چەند ترسناکن، بە تایبەتیش زۆر لە سەر (ساواک)ەوە دەدواو دەیوت بە جۆرێک ئەشکەنجەی گیراوو بەندەکان دەدەن کە کەس تەحەمولی ناکات و هەر ناچاری دەکەن شتێک بدرکێنن و بەوپێیەش زەرەر _وەک خۆی دەیوت_ بە ئێمە بگەیێنێ.

وەک دەرکەوت لە دێیەکەدا خەستەخانە نەبوو، کە ئەوەش بەلامانەوە شتێکی نامۆ نەبوو، بەڵام ئەوەی لامان سەیر بوو، سەربازەکان هیچ کەرەستەیەکی تەندروستی یان دکتۆریان لەگەڵ نەبوو، چونکە لێپرسراوەکەیان فەرمانی دا کە بە زووترین کات بە پیکابێکی سەربازی خەسرەو بگەیێننە شاری شنۆ. بەرپرسەکەیان مۆڵەتی بە من و پێشمەرگەیەک دا لەگەڵ پیکابەکەدا بڕۆین و ئێمەش هەر خێرا بریندارەکەمان خستە پشتی پیکابەکەو لەگەڵیدا سوار بووین. ڕێگاکە زۆر سەخت و ناقۆڵا بوو، بۆیە سەری خەسرەوم نایە سەر ڕانم و کەوتمە دڵنیاکردنی کەوا بەرەو خەستەخانەی شارێک دەچین و خەمی نەبێت. نازانم تا چەند قسەکانمی لا مەبەست بوو، ئەو بە مەبەستی خۆ کوشتن تەقەی لە خۆی کردبوو، وەک ئەو دەیوت لە بەر ئێمە ئەو کارەی کردووە.

هەستم کرد توانای قسەکردنی هێشتا پێمابوو، بۆیە ویستم زیاتر هەوڵی لەگەڵ بدەم بەوەی کە ئێمە بەرەو خەستەخانە دەچین و لەوێش هەمووجۆرە چارەسەرێک دەست دەکەوێت. من دەمویست هیوای ژیانی پێ ببەخشمەوە، بەڵام ئەو هەر سەری دەلەقاند.

کاتێک گەیشتینە خەستەخانەکە، کە تا رادەیەک پەڕپووت دەهاتە پێش چاو، چونکە هیچ سیمایەکی خەستەخانەی مۆدێرنی پێوە دیار نەبوو، زیاتر لە ماڵێک دەچوو. کە چووینە ژوورەوە هیچ پێشوازییەکی ئەوتۆمان لێنەکرا، کەمایەی سەرسوڕمان بوو بۆمان. لە سۆراخی دکتۆر و ژووری عەمەلیات، برینپێچێک زۆر بە سادەیی پێی وتین:

_ هێشتا دکتۆر نەهاتووە.

من تا رادەیەک تووڕە بووم کە ئەوە چ پێشوازییەکە لە بریندارێک ، کەچی ئەو زۆر بە سادەییەوە وتی:

_ ئەی بۆ بریندارەکەتان نەبرد بۆ خەستەخانەیەکی سەربازی!

پرسیارێکی سەیر بوو لام ، بۆیە وتم:

_ بۆچی بیبەین بۆ نەخۆشخانەی سەربازی؟

لەوەڵامدا چاوی بەناوماندا گێڕاو سەیری سەربازەکەو پیکابە سەربازیەکەی کرد و وتی:

- ئەی ئێوە شەڕ بۆ ئەمان ناکەن؟

دیار بوو بە سەهو تێمان گەیشتبوو، ئەو و هاوەڵەکانی وایاندەزانی ئێمە بەکرێگیراوی رژێمین یان وەک ئەوان پێیان دەوت (دلاوەر) ، دلاوەر ئەو کوردانە بوون کە چەکیان بۆ رژێم هەڵدەگرت و پیاوی دەسەڵات بوون و دژایەتی هەموو جۆرە جموجۆڵێکی کوردانەیان دکرد.

وتم:

_ کاکی برا فریامان کەون، ئێمە پێشمەرگەی کوردستانی عێراقین و ڕێگەمان هەڵە کردووە. ئێمە ئێرانی نین.

هەر کە ئەو راستییەیان زانی ئیتر دەستوبرد پەلاماری خەسرەویان دا و رووەو ژووری نێو خەستەخانەکە بردیان. هەر هەموو داوای لێبوردنیان لێدەکردین.

هێندەی نەبرد هەموو لە ژوورەکە هاتنە دەرێ، یەکێکیان کە لە بەرپرسیان دەچوو، وتی:

_ وا چاکە بە زووترین کات بیگەیینە (رەزاییە)، ئەمە برینداریيەکەی زۆر قورسەو لێرە چارەسەر ناکرێ.

ئەوان لە سەربازەکەیان گەیاند، بۆیە ئیتر زۆر بە خێرایی خەسرەومان خستەوە پشتی پیکابەکەوەو بەرەو (رەزاییە) بەرێکەوتین. ئەوەی لام ناڕوون بوو لەو خەستەخانەیە هیچ دەستکاری شوێنی برینداریەکەیان نەکرد، جا نەیاندەزانی یان دکتۆری لێ نەبوو، یان نەیاندەوێرا لەبەر سەختی برینەکە هیچ شتێک بکەن.

پیکابەکە بەخێرایی دەڕۆیشت، خەسرەو چاوەکانی لێکنابوو، لێوەکانی دەبزواند سەرم نزیک کردەوە، داوای دایکی دەکرد. جاروبار چاوی هەڵدەبڕی، دەیویست قسەیەک بکات، نەیدەتوانی.

ڕێگای نێوان (شنۆ) و رەزاییە هەر نەدەبڕایەوەو تا دەهاتیش خەسرەو بێ توانا دەبینراو تەنها سیمایەکی زیندوویی کە پێوە دیاربوو بزواندنی لێوە وشکەکانی بوو.

ئەگەرچی پشتی پیکابەکە زۆر سارد بوو، بە هۆی تیژ ڕۆیشتنیشەوە،

ئێمە هێندەی تر سەرمامان دەبوو، بەڵام کەسمان ئاگامان لە سەرما نەبوو، هەموو لە خەمی ئەوەدا بووین کە بە زووترین کات بگەینە خەستەخانەیەک و چارەسەرێکی بریندارەکەمان بکەین.

نازانم چەندە بەڕێوە بووین، کە هەستم کرد خەسرەو بەتەواوی شل بووە، دەستی راستیم بەرز کردەوەو پەنجەم نایە سەر دەمارەکانی مەچەکی. خۆشبەختانە لێی دەدا، ئەوەش هەر بووژانەوەی هیوایەک بوو بۆمان.

کاتێک گەیشتینە خەستەخانەکە، سەرمان لە گەورەیی و پاک و تەمیزی سوڕما. هەر لەگەڵ ئەوەی (شنۆ)دا بەراورد نەدەکرا. ئەمەی ئێرە هەر لە خەستەخانەی وڵاتێکی پێشکەوتوو دەچوو.

هەموو بە گەرمی بە پیرمانەوە هاتن، دیار بوو ئاگادار کرابوون، چونکە دکتۆرەکان هەموو لە ئامادە باشیدا بوون.

لە سەر نەقالەیەک خەسرەویان یەکسەر بردە ژووری عەمەلیات ، من و پێشمەرگە و سەربازەکەش لە بەردەم ژوورەکەدا، لە سەر کورسییەک، لێی دانیشتین و نزامان بۆ بریندارەکەمان دەکرد.



## ٤١

ئێمە هەر سەیری دەرگای ژووری عەمەلیاتمان دەکردو چاوەڕێی خەبەرێکی دڵخۆشکەر بووین، هەرچەند دەمزانی برینکەی یەکجار سەختە، بەڵام بێ هیوا نەبووم، چونکە گەیاندبوومانە خەستەخانەیەکی باش لە شارێکی گەورەداو چەند دکتۆرێکیش خەریکی بوون.

ئێمە هەر چاومان لە سەر دەرگاکە بوو، لەناکاودا کرایەوە، دکتۆرێک هاتە دەرەوە بۆیە خێرا کەوتینە پرسیار، زیاتر سەربازەکە پرسیاری دەکرد، بەڵام من یەکسەر بێ هیوا بووم، چونکە دکتۆرەکە چاوی پڕ ببوو لە ئاوو فرمێسکی دەڕشت . ئەگەرچی وا باو نییە دکتۆر راستی هەستی خۆی بەو شێوەیە نیشان بدات، چونکە رۆژانە دەیان بریندار و نەخۆشیان دێتە بەردەست کە رەنگە زۆربەیان نەتوانرێ لە مەرگ قوتار بکرێ، بەڵام دیار بوو مەرگی خەسرەو کاریگەری لە سەریان دانابوو ، چونکە کە باقی دکتۆرەکانیش هاتنە دەرێ ئەوانیش تەواو خەمناک و بێتاقەت دەهاتنە پێش چاو. بە کورتی ئێمە زوو لە دیمەنەکە تێگەیشتین کە نەیانتوانیوە هیچی بۆ بکەن، بۆیە ئیشارەتیان پێداین کە دەتوانین سەردانی ژوورەکە بکەین.

کە چوومە ژوورەوە، تەرمی خەسرەو لە سەر نەقالەیەک دانرابوو، کە قوماشی سپی سەر تەرمەکەم لادا، خەسرەو چاوی نوقابوو، جووڵەی

نەدەکرد، چەند جارێ دەستیم راوەشاند، بێهودە بوو.

لە گریان زیاتر هیچ چارەیەکی دیکە نەبوو، ئەوەی سەرنجی راکێشام لەوکاتەدا، سەربازەکەش لەگەڵ ئێمەدا هۆن هۆن فرمێسکی دەڕشت. ماوەیەک هەروا دەستەوەستان لە دەوری تەرمەکە راوەستا بووین و نەماندەزانی چی بکەین. نازانم چەند دەبوو وەستاوین کە کەسێک خۆی کرد بە ژوورەکەداو بە زمانی کوردی خۆی پێشکەش کردین و وتی:

_ کارمەندی ئەم خەستەخانەیەم، دکتۆرەکان دەڵێن بەداخەوە نەمانتوانی هیچ بکەین، چونکە برینداربیەکەی یەکجار کاریگەر بووە.

لە پرسیاری ئەوەی کە ئایا دەتوانین تەرمەکە لەگەڵ خۆمان بەزوویی ببەینەوە، لەوەڵامدا وتی:

_ تا توێکاری نەکرێ بڕوا ناکەم مۆڵەت بدرێ.

ئینجا کەوتە باسی توێکاری تەرم، کە دکتۆرەکان هەمیشە بۆ تێگەیشتن لە هۆی مردنەکە دەبوو ئەوکارە بکەن، بەڵام ئێمە ئەوەمان رەتکردەوەو من پێم وت:

_ ئەمە شەهیدە و رازی نین بە هیچ جۆرێک دەستکاری جەستەی بکرێ.

کارمەندەکە زۆر بە هێمنی پێی وتین:

_ ئەوە رۆتینی خەستەخانەیە و دەبێ بکرێ.

پاشان وتی:

_ بەڵام من هەر پرسیارێکتان بۆ دەکەم.

ئێمە لە سالۆنی خەستەخانەکەدا راوەستابووین و چاوەڕێی بڕیارمان

دەکرد کە هەواڵمان پێگەیشت کە دەستگایەکی نهێنی لەناو شارەوە دێت و دەیەوێ لە تەواوی ڕووداوەکە بگات.

لەراستیدا ئێمە لەو داوایە تێنەدەگەیشتین، تازە دەیانویست چی بزانن؟.

لەگەڵ ئەوەشدا، چاوەڕوانی گەیشتنی شاندەکەیان بووین.

لەدەستدانی خەسرەو کۆستێکی گەورە بوو، ئەگەرچی بۆ ماوەیەکی کورت یەکترمان ناسی بەڵام دەتوت دەیان ساڵە برادەرین. ئێمە بەجۆرێک تێکەڵ بووبووین و هەمیشە پێکەوە بووین وامدەزانی لە منداڵییەوە هاوڕێین، خەسرەو نموونەی پێشمەرگەیەکی قارەمان و لەخۆ بردوو بوو، هەر قوربانیدان بەخۆی شایەتی گەورەیی و شۆڕشگێڕی بوو. ئەو لە دواجاریشدا دەیوت لەبەر ئێمە خۆی دەکوژێ، بۆ ئەوە ببێتە قوربانی و ئێمە لە داهاتوویەکی نادیار قوتار بکات. من لەو ماوەیەدا وام هەستدەکرد کە دەبێ جۆرە پەیوەندییەکی لەگەڵ گرووپە چەپەکانی دژ بە شادا هەبوو بێت. وا بزانم هەر ئەوەش بوو کە ئەو بڕیارەی دا. وەک خۆی دەیوت، نەکو نەتوانێ، لە ژێر گوشاری ئەشکەنجەدا بەرگە بگرێ و شتێک بدرکێنێ و بەو پێیە ئێمەش بە سەر بەو گرووپانە لە قەڵەم بدرێین.

من لە خەیاڵی ڕۆژە سەختەکانی پێشوودا بووم کە چەند پیاوێک کە دیار بوو کارمەندی دەوڵەتن، هاتنە لامان و کۆمەڵێ پرسیاریان لێکردین کە لە ڕێی کارمەندە کوردەکەوە بۆیان دەکردینە کوردی.

ئێمە هیچی شاراوەمان نەبوو، پێشمەرگەی کوردستانی عێراقین و دژی حکوومەتی بەعس دەجەنگین و بەفر ڕێگەی لێ هەڵە کردووین و هاتووینەتە نێو خاکی ئێران و دەمانەوێ بە زووترین کات بگەڕێینەوە دیوی خۆمان.

وابزانم هەموو ئەو زانیارییانە بۆ ئەوان نوێ نەبوو، چونکە هیچیان

نەدەنووسی، لەوەدەچوو بیانەوێ شتێکی نوێمان لێ هەڵکرێنن کە ئێمە لەوە زیاترمان پێ نەبوو.

ئەمانە دەستگای جۆراوجۆری سیخوڕی بوون و هەریەک دەیویست خۆی زانیاری زیاتری دەست بکەوێت.

هەرچۆنێک بوو، پاش نیوەڕۆ، مۆڵەتیان داین کە تەرمەکە لەگەڵ خۆمان بەرینەوە. کارمەندی خەستەخانەکە هەستی کوردانەی خۆی بۆ نەدەشاردرایەوە، لەراستیدا زیاتر هەوڵی ئەو بوو کە وا بە ئاسانی تەرمی شەهیدمان چنگ کەوتەوە.

تەرمی شەهیدمان لە بەتانییەکەوە پێچاو خستمانە نێو پشتی پیکابەکەوە و کەوتینە رێ. من سەیری تەرمەکەی بەردەمم دەکرد، بڕوام نەدەکرد، هەمووی چەند کاتژمێرێک پێش ئێستا زیندوو بوو، وەکوو ئێمە قسەی دەکرد، کەچی ئێستا جەستەیەکی بێ گیان و بێ جووڵەیە. ئەگەرچی هەموومان کە بڕیاری ئەوەمان دا ببینە پێشمەرگە، چاوەڕێی ئەوەمان دەکرد کە لە شەڕێکدا، لەگەڵ دوژمن شەهید بین، بەڵام من هەرگیز بیرم بۆ ئەوە نەدەچوو کە مرۆڤ بە دەستی خۆی کۆتایی بە ژیانی خۆی بهێنێت . من بڕوام وایە خەسرەو وەک هەمیشە بۆمانی دووپات دەکردەوە کە ئەو خۆکوژییەی لە پێناوی ئێمەدا کردووە کە لەراستیدا هەر واش بوو، لە غیرەت و پیاوەتی و ئازایەتی خۆی ئەو کارەی ئەنجام دا بوو. گەر ئەم شەهیدە بمابایە دەبوو چ قارەمان و چ سەرکردەیەکی لێهاتووی لێ پەیدا بوایە.

خەیاڵم بۆ لای پێشمەرگەکانی خۆمان دەچوو، دەبێ چییان بە سەرهاتبێت، یان خۆمان چیمان بە سەردێ. تۆ بڵێی ئەمانە بە ئاسانی کێشەکەمان چارەسەر بکەن. دەبێ نیازی چییان هەبێت. من تاووتوێی هەموو ئەمانەم دەکرد و چارەسەر نەدەهاتە پێش چاوم. ئەوان هەر بە گومانەوە لە ئێمەیان دەڕوانی، ئەوان تا رادەیەک لە سەر هەق بوون، ئێمە زۆر هاتبووینە قووڵایی ئێرانەوە، ئەوە بۆ ئەوان بە ئاسانی هەزم

نەدەکرا. نازانم دوای لە دەستدانی ئەم شەهیدە هەڵوێستیان دەگۆڕێ. ئەمانە هەموو پرسیار بوون لە مێشکمدا گێنگڵی دەدا.

سەیری پێشمەرگەکەی هاوەڵم کرد، ئەو هەر بەبێدەنگی دەگریا و فرمێسکی دەڕشت.

لە پرسیاری ئەوەی لە کەیەوە شەهید دەناسێت وتی:

_ هەموو پێکەوە لە قەندیل نەماندی.

راستی دەکرد ، من خەیاڵم رۆیشتبوو ، یان مەبەستم هەر هێورکردنەوەی ئەو بوو.

دەمەو ئێوارە گەیشتینەوە ناو دێ. پێش ئەوەی بەرەو مزگەوت بچین شۆفیری پیکابەکە ئێمەی بردە لای گەورە لێپرسراوەکەیان.

لە راستیدا ئەویش هاوخەمی دەربڕی، بەڵام وتی:

_ تکا دەکەم باسی مەرگی مەکەن. ئێمە هەر ئەمشەو رەوانەتان دەکەین. با تەرمەکە لای ئێمە بێت.

****

## ٤٢

که گەیشتینەوە نزیک مزگەوتەکە. سەرنجم دا، سەربازەکان هەر وەک پێشوو ئامادە، بە دەوری مزگەوتەکەدا بڵاو کرابوونەوە. کاتێک چووینە ژوورەوە، پێشمەرگەکان بە خۆشحاڵی و تامەزرۆییەوە پێشوازیان لێکردین، هەموو خێرا لە دەورمان گردبوونەوەو هەر هەموو تاسووقی هەواڵی خەسرەو بوون. مامۆستا عەزیز یەکسەر وتی:

ـ ئەی خەسرەو؟

نەمدەزانی یەکسەر هەواڵی مەرگی ڕابگەیەنم، یان وەک لێپرسراوی سەربازەکان پێی وتم، تا سبەی چاوەڕوان بین. من وام بە باش زانی بارودۆخەکە نەورووژێنم و باری دەروونی هەمووان ئاڵۆز نەکەم ، بۆیە وتم:

ـ لە خەستەخانەیە لە شنۆ و لە ژێر چاودێری پزیشکیدایە.

هەموو عەوداڵی باری تەندروستیی بوون، دەیانویست بزانن چی بۆ کراوە، ئایا هیوای ژیانی لە بەردەمدایە. من بە گشتی بۆ دەربازبوون لە پرسیاری زیاتر وتم:

_ هیوادارم بتوانن کارێکی بۆ بکەن، بەڵام برینەکەی یەکجار قووڵ و سەخت بوو.

دەمویست بەوە نیشانی بدەم کە لە بەر سەختی برینەکەی، دوور نییە نەتوانن چارەسەری بکەن، هەر بۆیەش زیاتر وتم:

_ فیشەکەکە سەر دڵی گرتووە.

هەموو پەست و غەمبار دەهاتنە پێش چاو، من چاوم بە ناویاندا دەگێڕا کە هەستم کرد تفەنگەکان هیچیان لە سووچی ژوورەکەدا نەمابوون، لە پرسیاری ئەوەی کەچی بە سەر تفەنگەکان هاتووە، حاجی مەحموود هاتە پێشەوە لێم و وتی:

_ هەر دوای تەقەکە و ڕۆیشتنی ئێوە سەربازەکان دایان بە سەرماندا و هەموو تفەنگەکانیان برد و ئێمەش فریای هیچ نەکەوتین.

کەمێک ڕاوەستا و پاشان وتی:

_ بەڵام ئەفسەرەکە، کە لە نێوانماندا دێت و دەچێ هەواڵی بۆ هێناین کە خەممان نەبێت، چونکە لە سەر سنوور وەری دەگرینەوە.

منیش هەر بۆ ئەوەی خەبەرێکی خۆشیان پێڕابگەیەنم وتم:

_ لێپرسراوەکەشیان دەڵێ ڕەنگە هەر ئەمشەو بەرەو سنوورمان ببەن.

مامۆستا عەزیز ڕاستەوخۆ وتی:

_ ئەی خەسرەو؟

پرسیارێکی بەجێبوو، کەمێک ڕاوەستام، بۆ وەڵامێکی مەعقوول

دەگەڕام، پاشان وتم:

_ دیارە ئەویشمان دەدەنەوە.

پەلی مامۆستا عەزیزم گرت و بردمە سووچێکی ژوورەکەوە و پێکەوە دانیشتین. زۆر بە ئەسپایی سەرم نایە بن گوێی و وتم:

_ مەیکە بە هەرا، با ئەوانی دی نەزانن. شەهید بوو.

مامۆستا عەزیز ڕەنگی هەڵبزڕکا و یەکسەر چاوەکانی پڕبوون لە ئاو ، بەڵام خۆی ڕاگرت و هیچی نەدرکاند. تەنها سەری شۆڕ کردەوەو سەیری بەردەمی خۆی دەکرد، دەیویست بەوکارەی نەهێڵێ پێشمەرگەکانی تر، درک بە باری ئاڵۆزی بکەن.

پاشان مامۆستا عەزیز باسی ئەوەی بۆ کردم کە هەر بە ڕۆیشتنی ئێمە ئیدی دەستگا نهێنییەکان یەکەیەکە بانگی کردوون و پرسیاری هۆی هاتن بۆ ئێران و ناوی خۆیان و خانەوادەیان و گەلێک زانیاری تری لێکردوون و ئەوانیش هەر هەموو ناوەکانی خۆیان گۆڕیوەو کەمترین زانیاریان بە دەستەوە داوە. خۆشبەختانە کەسیش پێناسەی پێنەبووە تا ناوی ڕاستەقینەی ئاشکرا بکات.

منیش باسی ئەوەم بۆ کرد کە چۆن چووین بۆ ڕەزائیە و چۆن ئەوان لەوێ هەمان لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ ئێمەش کردووە، بەڵام لەوێش هیچیان دەست نەکەوتووە.

مامۆستا عەزیز لە سەر قسەکانی بەردەوام بوو، ئیشارەتێکی بۆ شێخ سدیق کرد و وتی:

_ سەیر ئەوەیە شێخ سدیق وەک شێخ سادق خۆی پێشکەش کردووە.

کاتی پێکەنین نەبوو، دەنا دەمدایە قاقای پێکەنین، بەڵام لە باتی وتم:

_ دیارە نەیویستووە دەستبەرداری شێخایەتییەکەی بێت.

وابزانم بزەیەک گرتی، بەڵام هەر زوو ئاوای کرد و وتی:

_ تۆ بڵێی ئەمانە راست بکەن لەگەڵمان!.

لەراستیدا نەدەزانرا، بەڵام هیوادار بووم و ئەوەم دووپاتدەکردەوە کە ئێمە هیچ کارێکمان دژی دەوڵەتی ئێران ئەنجام نەداوە، بۆیە بڕوام وایە هەر دەبێ لێگەڕێن، خاکەکەیان بەجێبهێڵین.

پاشان مامۆستا عەزیز وتی:

_ ئەی ئەم تەقەکردنەی خەسرەو نایانخاتە گومانەوە. لە تۆیان نەپرسی بۆ فیشەکی ناوە بەخۆیەوە.

منیش وتم:

_ بە بەرپرسەکەیانم وت کە مەسەلەکە سودفە بووە، چونکە بێ ئاگا بووە لەوەی تفەنگەکەی لە سەر پێیە، پەنجەی بەر پەلەپیتکەی تفەنگەکە کەوتووە، دەنا مەسەلەی خۆکوشتن لە ئارادا نەبووە.

لەراستیدا ئەوانەم لە رەزائیە بە دەستگا نهێنییەکان وت، چونکە بە هیچ شێوەیەک نەدەکرا باسی خۆکوشتن بۆ ئەوانە بکەیت. وابزانم ئەوانیش تارادەیەک بڕوایان پێ کردین.

ئەوەی باش بوو ئەوانە هیچیان دەربارەی خەسرەو نەدەزانی، دیارە هیچ زانیارییەکی وایان لا نەبوو، چونکە من هەر زوو پێناسەکەیم لە

ناو بردبوو. ئەوان بڕوایان کرد کە ئێمە هەموو پێشمەرگەی کوردستانی عێراقین، چونکە ئیدی لەسەری نەڕۆیشتن.

وابزانم شەهیدبوونی خەسرەو زیاتر قەناعەتی پێ هێنان کە بەزووترین کات ئەو دیو سنوورمان بکەن و لە دەستمان رزگار بن.

لەگەڵ مامۆستا عەزیز و شێخ سدیق و حاجی مەحموود ئەو شەوە تا درەنگانی شەو پێکەوە دانیشتین و باسی داهاتوومان دەکرد ، هەمیشە هەر ئەو پرسیارە دەکرا، تۆ بڵێی ئەمانە لەگەڵمان راستگۆ دەرچن و بگەڕێینەوە بۆ لای خۆمان.

حاجی مەحموود وەک شیکردنەوەیەکی بارودۆخەکە وتی:

_ من بڕوام وایە وازمان لێ بهێنن، چونکە نانێکی زۆرو پەنیریان بۆ هێناوین کە لەگەڵ خۆمان بیبەین. من ئەمە وا تێدەگەم کە بە زووترین کات بەرمان بدەن.

لە جێی خۆم لێی پاڵ کەوتم. زۆر هیلاک بووم. دیمەنەکانم پچڕپچڕ دەهاتەوە پێش چاو. منیش وتم:

_ هیوادارم.

***

## ٤٣

له غەڵبەغەڵبی دەرەوەی مزگەوتەکە بە ئاگا هاتمەوە ، جموجۆڵێکی نائاسایی هەست پێدەکرا. پێشمەرگەکان هەموو خەبەریان ببۆوە. دەنگی هاتوچۆی ئۆتۆمبێلێکی زۆر دەهات. کە لە کاتژمێرم پرسی وتیان چواری سەر لەبەیانییە، لەوە نەدەچوو خەوم لێکەوتبێت، ئەفسەری پەیوەندی هاتە ژووریَ بۆ لامان، باسی ئەوەی کرد کە هەر ئێستا دەمانبەن بۆ سەر سنوورو لەویَ ماڵئاواییمان لێدەکەن. بۆ هەموومان خەبەرێکی خۆش بوو، بەڵام ئەی چەکەکانمان.

له پرسیاری ئەوەش ئەفسەرەکە وتی:

_هەموویتان لە سەر سنوور دەدرێتەوە.

کە چووینە دەرەوە، چەندین لۆری سەربازی لە بەردەم مزگەوتەکە وەستابوون، سوپایەکی زۆریش لەو دەورووبەرە بوون. شەوێکی یەکجار سارد بوو لە دەرەوە. هەر دوو پێشمەرگەیان خستە پشتی لۆرییەکەوە، بەو پێیە بە سەر پانزە لۆریدا دابەشکراین. من و مامۆستا عەزیز بەریەک کەوتین. کە لە جێی پشتەوەی لۆرییەکە دانیشتین وتی:

ـ تۆ بڵێی بەراستیان بێت و بۆ شوێنێکی نادیار نەمانبەن؟

پرسیارێکی بەجێ بوو، بەڵام تازە کار لە دەست ئێمەدا ترازابوو. لە وەلامدا وتم:

ـ بڕوا ناکەم.

خۆشم گومانم هەبوو، بەڵام نەمدەویست ئەو زیاتر دڵخۆرت بکەم. ئەو وتی:

ـ ئەی بۆ بەم شەوە درەنگە دەمانبەن؟ بۆ چاوەڕێیان نەکرد تا ڕۆژ دەبێتەوە.

راستی دەکرد، بەڵام لای من وەڵامێکی گونجاو نەبوو ، بۆیە وتم:

ـ ئێستا کارەکە لەدەست ئێمەدا نییە . با بزانین چی روو دەدات.

لۆرییەکان کەوتنە جووڵە، ئەوسا ئیدی بەتەواوی هەستمان بە سەرما کرد، تا توندتریش دەڕۆیشت سەرما زیاتر دەبوو، بۆیە لە سەر زەوی لۆرییەکە دانیشتین و پشتمان نا بە پشتی یەکدییەوە بۆ ئەوەی رەق هەڵنەیەین. لەراستیدا سوودی هەبوو، بڕێک گەرمی کەوتە نێو گیانمان.

هەر دووک بێدەنگ دانیشتبووین و لە هەموو پێچ و تاسەیەکیشدا بەم لاولادا دەکەوتین، مامۆستا عەزیز پەتی بێدەنگی پچڕاندو وتی:

ـ ئەی تەرمەکەی شەهید؟

لە وەڵامیدا وتم:

ـ هیوادارین ئەویشمان لەگەڵ بێت.

سەرنجی دەرەوەی لۆرییەکەم دا، دنیا وردە وردە رووناک دەبووەوەو دەورووبەر دەبینرا. ئێمە بەرەو چۆڵەوانی دەڕۆیشتین، دیار بوو بەرەو سنوور دەچووین، بۆیە بە مامۆستا عەزیزم وت:

ـ ترست نەبێ بەرەو سنوور دەڕۆین.

ئەمەم بۆیە وت، چونکە هیچ ئاوەدانییەک نەدەهاتە بەرچاو و بەرەو ناوچە شاخاوییەکان دەڕۆیشتین و بەو پێیەش دەبوو بەرەو سنوور بچین.

بەیانییەکی یەکجار سارد بوو، ئێمە بەرەو کوێستان دەچووین، شاخەکانی دەورووبەرمان سەراپای بەفر بوو.

لۆرییەکان هەمووی لە قەدپاڵ شاخێکدا راوەستان، وەک دەرکەوت ئیتر رێگای ئۆتۆمبیل نەدەماو لەوە زیاتر نەدەکرا بڕۆن.

کە لە لۆرییەکە هاتینە خوارێ، سەدان سەرباز ئەو ناوەی تەنی بوو، گردەکانی نزیکمان بە پاسەوان گیرابوون. لێپرسراوە گەورەکە هەموومانی کۆ کردەوەو وەک وتار بدات وتی:

ـ براینە، ئەوا گەیشتینە سنوور و ئێرە دوا مەنزڵی ئێمەیە.

کەمێک راوەستا، یەکێک لە ئەفسەرەکان بە کوردییەکی زۆر رەوان تەرجەمەی بۆ دەکردین. ئەفسەرە گەورەکە بەردەوام بووو وتی:

ـ بەداخەوە برادەرێکتان بەهۆی سەختی برینەکانییەوە گیانی لەدەستدا. ئەوا هەر ئێستا ئەویشتان تەسلیم دەکەین، بەڵام تکایە لە

نێو خاکی ئێراندا مەینێژن و بیبەنە دیوی خۆتان.

بۆ من ئەوە هەواڵێکی تازە نەبوو، بەڵام بۆ پێشمەرگەکانی تر خەبەرێکی کتوپڕ و چاوەڕواننەکراو بوو، چونکە من لە سەر راسپاردەی ئەفسەرە گەورەکە پێم وتبوون کە لە خەستەخانەیە و لە ژێر چارەسەریدایە. لەگەڵ ئەوەشدا کەس هیچی نەوت و هەموو چاوەڕێی بینینی تەرمەکەیان دەکرد.

پاشان ئەفسەرەکە بەردەوام بوو:

_ ئێستا هەر هەموو چەکەکانتان دەدەینەوە بێ نوقسانی و هەندێ خواردنی دیکەشمان بۆ هێناون بۆ رێگاتان.

ئەمەی وت و ئیشارەتی بە سەربازەکانی کرد و ئەوانیش هەموو چەکەکانیان کە لە لۆرییەکدا بوو بە تەنها، بە سەردا دابەشکردینەوە.

ئەفسەرەکە دوای وەرگرتنەوەی چەکەکانمان وتی:

_ پاچ و کفن و هەموو پێداویستی ناشتنی تەرمەکەشمان بۆ ئامادە کردوون. بەڵام تکایە لە دیوی خۆتان بینێژن.

هیچ گومان لەوەدا نەبوو کە ئێمەش بە هیچ جۆرێک نەماندەویست لە دیوی ئێراندا بینێژین. ئەوەی زۆر سەرنجی راکێشام بەو بەیانییە سارده، ئەو ئەفسەرە کوردە بوو کە بە کوردییەکی رەوان تەرجەمەی بۆ دەکردین، هەستم کرد چاوەکانی پڕ بووە لە ئاو. دیار بوو دەگریا، بۆیە چوومە نزیکیەوەو وتم:

_ بۆ ئێمە دەگری؟

یەکسەر وەک چاوەڕێی ئەو پرسیارە بێت وتی:

_ بەڵێ، منیش کوردم و خەڵکی سنەم.

زۆر بە چاوی بەزەییەوە تێیدەڕوانین کە خۆشەویستی لێ دەباری، وتی:

_ ئێوە کارێکی مەزن دەکەن.

بۆ ئەفسەر لە ناو سوپای ئێراندا، ئەوە کارێکی ئاسان نەبوو کە بەو شێوەیە هەستی بەرامبەر بە کورد دەربڕێ، بەڵام سەلماندی کە بوێری زاڵە بە سەر ترسداو ناتوانێ هەستی کوردایەتی خۆی دەرنەبڕێت. بە ئەسپایی پێی وتم:

_ لێپرسراوەکەشمان _ مەبەستی ئەفسەرە گەورەکە بوو _ ئەویش کوردە.

ئەمە وای لە من کرد کە بچمە نزیک ئەفسەرە گەورەکە و پێی بڵێم:

_ بەڕێزتان کوردن؟

سەیرێکی کردم و چاوی بە ناو سەربازەکانیدا دەگێڕاو وتی:

_ من ئێرانیم.

بەو هەموو ئەستێرەو نیشانەوە دەبوو لە ژەنەڕاڵ کەمتر نەبێ ، لە وەڵامیدا وتم:

_ دەزانم ئێرانیت ، بەڵام بەڕێزتان کوردن؟

جارێکیتر بە لەهجەیەکی سەربازییانە وتی:

_ من ئێرانیم.

هیچ پێویستی بە مشتومڕی زیاتر نەدەکرد. سوپاسیم کردو ئەویش خواحافیزی لێکردین.

تەرمەکەیان بۆ خستبووینە سەر نەقالەیەک و دوو پێشمەرگە هەڵیان گرت.

ئێمە کەوتینە ڕێ، ئەفسەرە کوردەکە هاتە نزیکمەوەو ئیشارەتی بۆ شاخەکەی بەرامبەرمان کرد و وتی:

_ ئەوەش کێلە شینە.

کە بۆ دواجار ئاوڕم لێدایەوە، ئەو هەر دەگریا.

***

## ٤٤

بەرەو سنووری خۆمان کەوتینە ڕێ، دەمەو نیوەڕۆ گەیشتینە سەر لوتکەی شاخەکە، لەوێ میلەکانی سنوور بە ئاشکرا دەبینران. لای میلی ژمارە (١٢٠) هەموو پشووماندا. هەڵگرتنی تەرمی شەهید و بە نەقالە، کارێکی یەکجار دژوار بوو، ئەگەرچی زوو زوو نۆرەمان دەکرد و تەرمەکەمان هەڵدەگرت، بەڵام لە هەورازدا زۆر ئەزیەتمان بە دەستیەوە دەخوارد. چەند جارێک تەرمەکە لە نەقالەکە کەوتە خوارێ، بەڵام خۆشبەختانە بە یەکجاری گلۆر نەدەبووەوە بۆ بناری شاخەکە.

لە سەر شاخەکە، کەوتینە وتووێژ، سەبارەت بە چۆنیەتی ناشتنی تەرمی شەهیدەکانمان هەبوو دەیوت با تا ئاوەدانییەکی لای خۆمان بیبەین و لە دێیەکی لای خۆمان بینێژین، بەڵام ئەو کارە هەروا ئاسان نەبوو بۆیە هەموو پاش بیروڕا گۆڕینەوە گەیشتینە ئەو قەناعەتەی کە باشتر وایە لە نزیک میلی سنوورەوە بە دیوی خۆمان، گۆڕی بۆ هەڵبکەنین و تەسلیمی ژێر خاکی بکەین.

هەڵکەندنی چاڵ لە سەر ئەو شاخە بەردینە کارێکی یەکجار ئاسان

نەبوو، ئەگەرچی سەربازەکان پاچ و خاکەنازو هەموو پێداویستیی ناشتنیان پێ دابووین، لەگەڵ ئەوەشدا دۆزینەوەی شوێنی هەڵکەندن کە بتوانرێ بە ئاسانی هەڵبکەندرێ بە ئاسانی بۆمان پەیدا نەدەبوو، بەڵام چار چی بوو، هەر دەبوو بەردەوام بین.

بەهەوڵ و تەقەلای هەموو پێشمەرگەکان، کە نۆرەمان دەکرد لە هەڵکەندن توانیمان چاڵێکی وا هەڵبکەنین کە بتوانین تەرمەکەی تێدا بشارینەوە، ئەگەرچی لە راستیدا نەمانتوانی گۆڕەکە بە تەواوی هەڵبکەنین، بەڵام کاتێک ویستمان تەرمەکە بشارینەوە، زۆربەیان دەیانوت دەبێ بشۆرێ و ئینجا بە خاک بسپێردرێ، بەڵام ئاو لەوشاخە ساردە لە کوێ پەیدا دەبوو. بۆیە ئێمە هەموو بەوە رازی بووین کە مادام شەهیدە ئیدی دەتوانرێت بە جلەکانییەوە، بێ شتن، بنێژرێت.

هەر واشمان کرد، پاش داپۆشینی، کار هاتە سەر ئەوەی تەلقین بدرێ. لە راستیدا ئەوەی کە بە خەیاڵدا نەدەهات مەسەلەی تەڵقین بوو، ئەوە لە کاتی ئاساییدا و لە نێو شارو ئاوەدانیدا دەبوو بە ئاسانی بکرێ، بەڵام لەم شاخ و کێوە چۆن دەکرا؟ ئەی مەلا؟

لەوەڵامی ئەوەدا ، هەموو دەستیان بۆ شێخ سدیق درێژ کرد. لە راستیدا من تا ئەوکاتە وامدەزانی ئەوە تەنیا نازناوە، بە ناوەکەیەوە، کەچی دەرکەوت کاری مەلایەتیش دەزانێ.

بۆیە بە تێکڕا داوا لە شێخ سدیق کرا کە بەو کارە ئایینییە هەڵبستێ، بەڵام شێخ نەیدەویست جێبە جێی بکات و دەیوت کە حەز ناکات ئەو ئەو کارە بکات. مامۆستا عەزیز بە دەنگی بەرز کە هەموو گوێمان لێ بوو، وتی:

ـــ رەنگە تەڵقینی بیر چووبێتەوە.

شێخ سەدیق تووڕەیی لە سەروچاویدا بەدی دەکرا، وتی:

ـ نەخێر، بەڵام نوێژی نیم.

من هیچ حاڵی نەبووم، بۆیە داوای روونکردنەوەمان لە شێخ کرد، ئەویش لە وەڵامدا وتی:

ـ کاکی برا، دەبێ ئاوم بۆ پەیدا بکەن بۆ ئەوەی دەستنوێژ هەڵبگرم.

مامۆستا عەزیز هاتە لامەوەو بە ئەسپایی پێی وتم:

ـ شەو خەوی دیوە!!

ئێرانییەکان چەند مەتارەیەک ئاویان پێدابووین بۆ رێگا، بۆیە یەکەو مەتارە ئاومان کرد بە دەست و قاچ و سەروچاوی شێخدا، ئیدی کەوتە تەڵقین.

نازانم تا چەند ئەوەی لە سەر گۆڕەکە خوێندی لە تەڵقین دەچوو ، چونکە بە زمانێکی عەرەبی زۆر پەڕپووت، رستەکانی دەوتەوە. بۆ ئێمە ئەوە هیچ گرنگ نەبوو، دەمانویست کارەکە هەرچۆنێک دەبێت بە خێرایی ئەنجام بدات و بکەوینە رێ.

حاجی مەحموود پاشان پرسی کە ئایا ئاوەدانی نزیک دەکەوێتە رێگەمان، شێخ لە وەڵامدا وەک هەمیشە وتی:

ـ گەر باش بڕۆین رەنگە پێش تاریک بوون بگەین.

ئەوە لای من هەر ئەوەی دەگەیاند کە ئەمڕۆش بە هیچ شوێنێک ناگەین، بۆیە هەر کە شێخ سەدیق لە مەراسیمەکەی بووەوە، هەموو ماڵئاواییمان لە گۆڕی شەهید کرد و سەرەو خوار کەوتینە رێ. لە

دەستدانی خەسرەو، کارەساتێکی خەمناک بوو بۆ هەموومان، لەو ماوە کورتەدا، هەموو لەوە تێگەیشتین کە خەسرەو مرۆڤێکی چەند بە کەڵک و پێشمەرگەیەکی چەند ئازاو قوربانی دەر بوو.

جارێکیتر رووەو نادیار کەوتینە رێ، بەڵام باشی ئەمجارەیان هەر ئەوندە بوو کە ئێمە لە ناو خاکی خۆماندابن و رێگەش هەڵە بکەین تووشی بەڵا نابین. مامۆستا عەزیز بە تەنیشتمەوە دەرۆیشت و بە ئەسپایی پێی وتم:

_ ئەرێ ئەوە شێخ سادق بە عەرەبی چی دەوت.

نەمتوانی پێنەکەنم. وتم:

_ گرنگ نییە چی دەوت، گرنگ ئەوەیە پێشمەرگەکان کەس لە زمانی عەرەبی ناگات.

وەک پشتگیرییەک بۆ شێخ سدیق چوومە نزیکیەوەو وتم:

_ مەلا سدیق نەمزانی ئەم بەزمەش دەزانی.

شێخ سدیق ئەوەی بە وەسفی خۆی لە قەڵەمدا ، چونکە سەربەرزانە وتی:

_ مرۆڤ لە ژیاندا دەبێ هەموو شتێک بزانێ.

عەزیز بەدەم رێگاوە ئاورێ لێدامەوەو وتی:

_ بە شەرەف خۆشی نەیدەزانی دەڵێ چی!

ئەمەی زۆر بە ئەسپایی وت، بە رادەیەک، کە بروانەدەکرا شێخ سدیق

گوێی لە هیچی بووبێت، چونکە ئەو ڕێک و ڕاست دەڕۆیشت و ئاوڕی لێنەدەدایەوە.

جارێکی تر خۆم گەیاندەوە حاجی مەحموود و لە پرسیاری ئەوەی گەر هیچ ئاوەدانییەک تا شەو نەهاتە ڕێگەمان چی بکەین. ئەو وتی:

_ هەندێ دێی گواستراوەو کاولکراو دێتە ڕێگەمان، گەر نەگەیشتینە ئاوەدانی ئەوا دەتوانین شەو لە کەلاوەیەکدا ڕۆژ بکەینەوە.

ئەوەش هەر هیوایەک بوو، ترووسکاییەکی دەدا بە داهاتوو.

❊❊❊

## ٤٥

ئێمە زۆر بە باشی دەڕۆیشتین بە تایبەتی کە سەرکەوتنمان بڕی بوو، تەنها بەرەو خوار دەهاتین، نان و پێخۆری باشیشمان پێ بوو، لەگەڵ ئەوەشدا وەک حاجی مەحمود پێشبینی دەکرد، نەگەیشتینە هیچ ئاوەدانییەک. پێش تاریک بوون کەلاوەی دێیەکی رووخێنراو هاتە سەر رێگەمان، بۆیە حاجی پێشنیاری بۆ هەمووان کرد کە شەو لەو دێ رووخاوە بە سەر بەرین، بە تایبەتی کە دارو پەردوویەکی زۆری لێبوو کە دەمانتوانی بۆ ئاگر کردنەوە سوودی لێوەرگرین.

پێشمەرگەکان هەر زوو کەوتنە ئاگر کردنەوە و هەر چوار پێنجێک لە دەوری گرددەبوونەوە. مامۆستا عەزیز کە سەرمابردەڵەیی خۆی نەدەشاردەوە دارە ڕایەکی گەورەی دۆزییەوە و بە یارمەتی یەک دوو پێشمەرگە، بۆ لای ئێمە هێناو کەوتە گڕدانی کە لە بەر گەورەیی و ئەستووری کارێکی زۆر دژوار بوو. هەرچۆنێک بێت وەک دار گوێنییەکانی قەندیل نەبوو کە هەر گڕ نەگرێ. بە شارەزایی حاجی مەحموود و فوو کردنی بەردەوامی شێخ سدیق دارەکە کڵپەی لێ هەستاو هەموو دەورووبەری رۆشن کردەوە. عەزیز هاتەلامەوە و بە خۆشحاڵییەوە لە گڕی ئاگرەکەی دەڕوانی، وتی:

ـ بڕوام وایە ئەم ئاگرە تا بەیانی نەکوژێتەوە.

ئەو شەوە، ئێمەو تێکڕا پێشمەرگەکان لە دەوری کۆبووینەوەو هەموو پشتمان کردە ئاگرەکە و چاوەڕوانی رۆژی داهاتوو بووین.

ئەگەرچی ئەو شەوەش هەر نەدەڕۆیشت، بەڵام بوونی خواردن و گەرمی و نزیکبوونەوەمان لە بارەگاکانی سەرکردایەتی هیوای دەخوڵقاند بۆیە بە دەمەتەقێوە هەرچۆنێک بێت، شەوەکەمان بردەسەر.

کە رۆژ بووەوە، عەزیز راستی دەکرد هێشتا ئاگرەکە هەر مابوو، بەڵام بووبوو بە پشکۆ.

رۆژێکی خۆشبوو، هەور بەری ئاسمانی بەردابوو، خۆر لە پشتی شاخەکەوە وردە وردە سەری دەردەهێنا و یەکجار گەورە دەهاتە پێش چاو و زۆریش رووناک بوو. دەبوو هی پاکی ژینگەی ئەو ناوە بووبێت کە هیچ ئاوەدانییەکی لێ نەبوو.

کەوتینەوە رێ، هێزو وزەو تینی نوێمان بەبەردا هاتبووەوە، بە تایبەتی ئەمجارە دەمانزانی کە هەر ئەمڕۆ دەگەین بە برادەران و ئیدی پشوویەکی راستەقینە دەدەین.

وەک حاجی لە رێگە بۆی باس کردین، ئەو ناوچەیەی پێیدا تێدەپەڕین، پێیان دەوت ناوچەی (لۆلان) کە عەشیرەتی برادۆستی تێدا دەژیا.

ئێمە دەمەو عەسر گەیشتینە دێی جورجان و بە بینینی پێشمەرگە، گەلێک شادمان بووین. هەر زوو پێشمەرگەکان لە دەورمان کۆ بوونەوە، هەموو دەیویست هەواڵی ناوچەی سۆران بە تایبەتی سلێمانی بزانێ.

هەر لەوێ تێبینیم کرد کە زۆربەی پێشمەرگەکان خەڵکی یان سلێمانی یان دەوروبەری بوون و هەر لەوێ کۆمەڵێ برادەری کۆنم دی کە لە زووەوە نەمدیبوون و بە بینینیان گەلێک کەیف خۆش بووم.

یەکێک لەوانە مولازم عومەر بوو، کە لە ساڵەکانی حەفتاوە یەکترمان دەناسی، بەڵام هێند تێکەڵ نەبووین، بۆیە لەو دێ دوورەدەستە

فرسەتێکی باش بوو بۆ هەردووکمان کە لە نزیکەوە یەکتر زیاتر بناسین. مولازم عومەر ئەفسەرێکی سوپای عێراق بوو، لە سەرەتای حەفتاکاندا بەشداری لە شۆڕشی ئەیلوول کردبوو، پاش شکستی شۆڕش، وەکو هەزاران پێشمەرگەی دیکە گەڕێنرابووەوە بۆ خوارووی عێراق، بە پلەیەکی مەدەنی دامەزرابوو. بەڵام ئەم هەر لە سەرەتای دروستبوونی شۆڕشی نوێوە، پەیوەندی بە پێشمەرگەوە کردبوو. ئەو ساڵێک پێش من چووبووە دەرەوە. ئەو شەوە لە یەکێک لە ماڵەکانی دێ دابەشکراین و پێکەوە تا درەنگانی شەو خەریکی قسەو باس بووین. من باسی سلێمانی و چۆنییەتی دەربازبوونم لە زیندان بۆ دەکرد و بەسەرهاتی جەولەکەمان لە قەندیل و لە ئێران بۆ دەگێڕایەوە، ئەویش باسی ژیانی خۆی لە خوارووی عێراق و ئەو ماوەی پێشمەرگایەتییەی بۆ دەگێڕامەوە. هەر زوو هەستم بە نزیکبوونەوەیەک کرد لە یەکتری.

ئەو شەوە زانیارییەکی زۆری سەبارەت بە ناوچەکە پێدام کە بۆ من زۆر پێویست بوو. ئەو باسی ئەوەی بۆ کردم کە ئەم ناوچەیە عەشیرەتێکی گەورەی تێدا دەژی و ئێستا ئێمە هەموو میوانی ئەوانین و لە ماڵەکانی ئەوان نان دەخۆین و دەنووین، تا ئەوکاتەی چەکەکان دەگات و ئەم ناوچەیە بە جێ دەهێڵین.

مولازم ئەوەشی بۆ باسکردم کە ئەمانە هەموو پابەندی سەرۆک هۆزەکەیانن و هیچ پەیوەندیان بە حزب و ڕێکخستنەوە نییە و ئەوان تەنها وەک میوان سەیرمان دەکەن.

لای خۆشمەوە، بە دوورو درێژی، باسی چۆنییەتی شەهید بوونی خەسرەوم بۆ کرد. دیار بوو ئەو پێشتر دەیناسی و زۆر دڵگران بوو بە شەهید بوونی. تامەزرۆی گەیشتنی چەکەکان بووم، بۆیە پرسیاری ئەوەم لێکرد کە کەی ئەو چەکانە لە سووریاوە دەگات لە وەڵامدا وتی:

ــ نازانرێ کەی. بەڵام دەگات چونکە چەکەکان ئامادە کراون.

له راستیدا، هەر گەیشتنمان بە سێگۆشەی سنوور سەرکەوتنێک بوو بۆ خۆی. بە لای منەوە یەکێک لە ئامانجەکان بەدی هێنرابوو، ئەویتر چاوەڕوانی گەیشتنی چەکەکان بوو. ئەوەی گرنگ بوو ئیدی رێی وا دوور و درێژ بەو نزیکانە لە بەردەمدا نەبوو. دەمانتوانی پشوویەکی باش بدەین و لەگەڵ پێشمەرگەکانی تردا یەکتر بناسین.

هەستمکرد مولازمیش خەوی دەهات بۆیە وتم:

ـ دیارە تۆش وەک ئێمە هیلاکی.

پیاو راست بڵێ مەبەستم خۆم بوو، هیلاکی ئەو چەند رۆژە وا بە زوویی لە جەستەمان دەرنەدەچوو. من زیاتر خەوم دەهات و ئەوەی وتم هەر پاساوێک بوو بۆ ئەوەی خۆشم بنووم.

پاشان وتم:

ـ رۆژانێکی زۆرمان لە بەردەمدایە.

ئەویش هەستی کرد کە تەواو شەکەتم و باوێشک لە سەر یەکدی دەدەم. بە دەم راکێشانی بەتانییەکەی بە سەر خۆیدا وتی:

ـ بێگومان .... بێگومان .

***

## ٤٦

بەیانی لە سەر پێشنیاری مولازم عومەر گەشتێکمان بە ناوچەکەدا کرد. لە راستیدا دێکانی ئەو ناوچەیە هەمووی خانووی پەرت و بڵاو بوون و لە نێو دۆڵەکەدا کە دەکەوتە نێوان دوو شاخی یەکجار بەرزەوە لە کەنار رووبارێکی کەم ئاو کە لە شاخەکەوە بۆ نێو دۆڵەکە دەهات دروستکرابوون وەک دەرکەوت سێ دێ لەو ناوچەیە هەبوون گەر بەدێ ناوزەد بکرێن، «خرێنە» کە دەکەوتە سەروومانەوە دوایین دێی کوردستانی عێراق بوو کە لە سەرووپەوە سنووری هەر سێ دەوڵەتی عێراق و ئێران و تورکیا تێکەڵ دەبوون. شوێنی حەوانەوەی ئێمەش «جورجان» ی ناو بوو و لە خواریشمانەوە دێی «لۆلان» بوو کە شوێنی سەرۆک هۆزی برادۆستییەکان بوو.

ئێمە پێشمەرگەیەکی زۆرمان لە نێو دۆڵەکەدا بەدی کرد کە ژمارەیان بە چەندسەد کەسێک دەخەملێندرا، بەڵام ئەوەی سەرنجی راکێشاین، هیچ بارەگایەکی سابیتمان نەدی و لە روونکردنەوەی ئەوەدا، مولازم وتی:

_ هەموو چاوەڕێی گەیشتنی چەکەکان دەکەین کە لە سووریاوە بۆمان

دێت، بۆیە پێشمەرگەکان بە سەر ماڵانی ئەم دێیانەدا دابەش کراون.

لای نیوەڕۆ کۆمەڵێ برادەری منداڵیم بەدی کرد کە زۆر دەمێک بوو نەمدیبوون. یەکێک لەوانە عوسمان قادر منەوەر بوو کە لەوێ بە عەفان ناسرابوو، کە لە ناوەڕاستی ساڵەکانی (٥٠) دا پێکەوە لە قوتابخانەی سەرەتایی بووین. بینینی ئەو، کۆمەڵێک یادگاری منداڵی بیرخستمەوە.

عوسمان کوڕێکی رووخۆش و قسە خۆش و پێشمەرگەیەکی خاوەن ئەزموون بوو، ئەو لە شۆڕشی ئەیلوولیشدا بەشداری کردبوو، بۆیە وەک پێشمەرگەیەکی قاڵبووی مەیدانی خەبات و شۆڕش دەناسرا.

لای ئێوارە، لە سەر دەستووری پێشمەرگە، بە ماڵەکاندا دابەشیان کردین. من و مامۆستا عەزیز بەر یەک ماڵ کەوتین.

خاوەن ماڵ وەک سەید شەریف خۆی پێ ناساندین، ئەو شەوە تا درەنگان بەدەم خواردنی شیوی ساوەرەوە، گەلێک بیرەوەری خۆی بۆ گێڕاینەوە . ئەوەی لای من مایەی پرسیار بوو، ئەوە بوو کە چۆن ئەو کە خەڵکی ئەو ناوچە دوورەدەستەیە، وا بە سۆرانییەکی بێ گرێ و گۆڵ لەگەڵمان دەئاخڤێت و ئەم پرسیارەشم راستەوخۆ لێکرد، لە وەڵامدا وتی:

ـ ئیتر بە هۆی ململانێی عەشیرەتەوە ماوەیەک لە هەولێر ژیاوین بۆیە وا باش فێری سۆرانی بووین.

پاشان زۆری باسی عەشیرەت و ململانێی هۆزەکانی ئەو ناوچەیەی بۆ کردین و داخی بۆ شەڕی نێوانیان دەخوارد و هیوای دەخواست کە جارێکی تر ئەوە دووپات نەبێتەوە.

ئێمەش لای خۆمانەوە بە تایبەتی مامۆستا عەزیز کە وەکو کادرێکی حزب خۆی ناساند باسی ناوچەی خۆمانی بە درێژی بۆ کرد و ئینجا کەوتە باسی سیاسەت.

عەزیز ئەو شەوە وەکو موحازەرە بدات هەرچی دەربارەی مارکسییەت و خەباتی چینایەتی دەزانی بۆ سەید شەریفی باس کرد. ئەو دەیوت خەباتی ئەم جارە دژی ئاغاو دەرەبەگ و سەرمایەدارییە. ئاگام لێ بوو سەید هەر سەری بۆ دەلەقاند، گومانم نەبوو کە زۆر لە قسەکانی نەدەگەیشت، بە تایبەتی کە باسی سەرمایەداری و نەمانی لە داهاتوودا دەکرد. چەند جارێک بە چاو و جاروباریش بەدەست ئیشارەتم بۆ دەکرد کە واز لەو قسانە بهێنێت و وتارەکەی کورت بکاتەوە، بەڵام ئەو وەک ئەوەی بڕیاری دابێت، مەسەلەکە بە کۆتایی بهێنێت ، هەر بەردەوام بوو.

دیار بوو سەید شەریف بەو قسانە زۆر کەیفی نەدەهات و رەنگە لە زۆریشی نەگەیشتبێت چونکە وتی:

_ تۆ لەوە گەڕێ. ئێوە مرۆڤی کێن؟.

- مرۆڤ؟!

حزبایەتی بەو جۆرەی ئێمە دەمانکرد ، لەوە نەدەچوو گەیشتبێتە ئەو ناوچانە یان هەر نیزامی خێڵایەتی لەو شوێنە دووردەستانە پەیڕەوی دەکراو لەوێش تەنها ئاغا یان سەرۆک هۆز حوکمی دەکرد، بۆیە پرسیارەکەی لە جێی خۆیدا بوو، بەڵام مامۆستا عەزیز بەو پرسیارە گەلێک قوشقی بوو، وتی:

_ مرۆڤی چی؟ من مرۆڤی کەس نیم.

جارێکی تر کەوتە باسی حزبایەتی و ڕۆڵی کاریگەری لە نێو میللەتدا. لەوە دەچوو دەمێک بێت تامەزرۆی شرۆڤەی بیروباوەڕی بێت، چونکە بەردەوام بوو، وتی:

_ تەنانەت من مرۆڤی (ماو) یش نیم.

گومان لەوەدا نەبوو کە مام سەید هەر نەیزانی (ماو) کە مەبەستی (ماوتسی تۆنگ) بوو کێیە، بڕوام وایە هەر نەشیبیستبوو، بۆیە زۆر بە سادەیی وتی:

_ ئەی کەواتە مرۆڤی کێیت؟

دیار بوو مامۆستا عەزیز خەریک بوو بە راستی تووڕە بێت، بۆیە هەر بۆ هێور کردنەوەی وتوویژی نێوانیان وتم:

_ ئێ دە تۆ لەو بپرسە، بزانە مرۆڤی کێیە.

سەید شەریف کەیفی زۆر بە قسەکەم هات، چونکە وتی:

_ من مرۆڤی حاجی موحەمەدم.

ئەگەرچی چرای ماڵەکە کز کز دەسووتا و بە ئاستەم سەروپۆتەڵاکی یەکدیمان دەدی ، بەڵام من نیشانەی پرسیارو سەر سوڕمانێکی گەورەم لە دەمو چاوی مامۆستا عەزیزدا خوێندەوە.

حاجی موحەمەد، سەرۆکی خێڵەکەیان بوو، زۆر بە ڕێزەوە باسی بۆ دەکردین. لای ئەو حزبایەتی و ئەو جۆرە شتانە نەی دەخوارد.

مامۆستا کەوتەوە باسی ڕێکخستن و ڕۆڵی لە نێو کۆمەڵدا ، تا گەیشتە ئەوەی خەریک بوو باسی نەمانی ڕۆڵی هۆز بکات ، بۆیە خێرا فریا

کەوتم ، چونکە گەر وانەبوایە گومانم نەبوو بەو شەوە سەید شەریف ماڵئاوایی لێدەکردین، بۆیە رووم کردە سەید و وتم:

_ ئێستا پێمان دەڵێت.

لەو کاتەدا، لە دەرگای دەرەوە درا. حاجی مەحموود بوو ، بۆ شوێن دەگەڕا. سەید پێشوازییەکی گەرمی لێکرد.

منیش بۆ کۆتایی هێنان بەو مشتومڕە، ئیشارەتم بە حاجی داو زۆر بە جدی وتم:

_ ئێمەش هەموو مرۆڤی حاجی مەحموودین.

مام سەید زۆر بە وردی سەرنجی حاجی دەدا. نازانم بڕوای دەکرد یان نا ...



## ٤٧

وەک نەریتی گوندییەکان، سەید شەریف تاریک و روون لە خەو هەستاو بەوپێیەش ئێمە لەگەڵی هەستیان و دوای خواردنی بەرچاییەکی سەر پێیی کە تەنها نانی وشک و جۆرە پەنیرێکی بۆندار بوو کە خواردنی بۆ ئێمە زۆر نامۆ نەبوو، بەڵام لەوە زیاتریش چنگ نەدەکەوت و دەبوو ئێمە مەمنوون بین، ئێمەش لەگەڵی چووینە دەرێ.

گوندییەکان، وەک پیشەی هەمیشەییان، هەموو زوو لە خەو هەڵدەستن و خەریکی کاروباری رۆژانەی خۆیان دەبن و ئێمەش دەبوو تا لە نێو ئەواندا بین پەیرەوی ئەو عادەتە بکەین، بەڵام ئێمە هیچ کارێکی ئەوتۆمان نەبوو، هەرچەند حاجی مەحموود وەک یارمەتییەک بۆ خانە خوێکەمان، بە تەورداسێک خەریکی برینی داری سووتان بوو. لە راستیدا من و مامۆستا عەزیز نەماندەزانی چ جۆرە یارمەتییەک بدەین بۆیە وەک بەردەستی حاجی یارمەتیدەر بووین.

مامۆستا عەزیز پێش نیوەڕۆ کترییەکی کۆنی قوپاوی لە نێو دێ دەستکەوتبوو، خەریکی چا لێنان بوو کە بەهۆیەوە کۆمەڵێک پێشمەرگەی بێکاری وەک خۆمان لە دەورمان گردبوونەوە.

باس باسی وتوویژ بوو لەگەڵ حکوومەتدا، کە بۆ ئێمە خەبەرێکی گەلێک ناکاو بوو، چونکە پێشمەرگە جارێ ئەو هێزەی نەبوو کە داوای وتووێژی لەگەڵ بکرێ، بۆیە ئێمە زیاتر وەک پڕوپاگەندەی نێو پێشمەرگە لە قەڵەممان دەدا، هەرچەند یەکێک لە پێشمەرگەکان کە خۆی وەک دکتۆر چالاک ناساند سوور بوو لە سەر راستی هەواڵەکەو دەیوت:

_ حاجی موحەمەد لە نێوان ئێمەو ئەواندایە.

حاجی موحەمەد مەبەستی سەرۆکی خێڵی برادۆست بوو، بۆیە مامۆستا عەزیز کە نەیتوانی خۆشحاڵی خۆی بۆ ئەو دەنگۆیانە بشارێتەوە وتی:

_ ئێمە لە ماڵی یەکێک لە پیاوانی حاجی موحەمەد دامەزراوین و ئێوارە کە دەچینەوە لێی دەپرسین و لەراستی و دروستی هەواڵەکە دەکۆڵینەوە.

هەموو بە تاسووقەوە چاوەڕێی ئێوارەمان دەکردو دەمانویست لە دەمی سەید شەریفەوە کە مرۆڤی حاجی بوو، شتێک ببیستین.

ئەو رۆژە تادەهات، هەواڵەکە زیاتر لە نێو پێشمەرگەدا بڵاو دەبۆوە، بە رادەیەک گەیشتینە قەناعەت وەک عەرەب دەڵێ، دووکەڵ بێ ئاگر نابێت.

بەڵام هێزی ئێمە، وەک بە چاو دەبینرا، بە هیچ جۆرێک لەگەڵ هێزو توانای دەوڵەتی عێراق بەراورد نەدەکرا، بۆیە زیاتر گومان لەو دەستپێشکەرییەی حکوومەت یان رازی بوونی بۆ گفتوگۆ دەکرا.

ئێوارە لەماڵی سەید شەریف، لە دەوری سینییەک ساوەر، بە نانی جۆوە، گردبووینەوە، هەموو پەلەی ئەوەمان بوو زوو لە خواردنەکە

رزگار بین و پرسیار لە حاجی بکەین.

بۆیە هەر دوای نانخواردن یەکەم پرسیار مامۆستا عەزیز کردی:

ـ تۆ بڵێی حکوومەتی عێراق ملی دابێ و وتوویژ لەگەڵمان ئەنجام بدات.

پرسیارێ بوو رووی دەمی دەکردە سەید شەریف، بۆیە ئەویش وتی:

ـ ماوەی یەک دوو مانگە سەرۆک هۆزمان خەریکە. دیارە حکوومەتیش موافەقەتی کردووە.

لەراستیدا هەموو خۆشحاڵ بووین، بەوەی کە بە زووترین کات دەگەڕێینەوە بۆ ژیانی ئاسایی خۆمان، مامۆستا عەزیز لە هەموومان زیاتر خۆشی بە سەروچاویەوە دەبینرا، چونکە ئەو تازە ژنی هێنابوو.

ئەو شەوە ئیدی کەوتینە شیکردنەوە، هەر یەکەو باری سەرنجێکی دەدا، هەمووش هیوای سەرکەتنیمان دەخواست.

بەڵام رژیمێکی ئاوا دڕندە، کە هەر یەک دوو ساڵ پێش ئێستا، هەموو هەوڵێکی دا بۆ شکست پێهێنانی شۆڕشی ئەیلوول و هەرچی تەنازولات هەیە بۆ شای ئێران کردی، چۆن و بۆ ، ملی بۆ ئەم پۆلە پێشمەرگەیە داوە، کە بە بەراورد لەگەڵ شۆڕشی ئەیلوول هەر بە قەدەر بەتالیۆنێک دەبووین. ئەوە منی دەخستە گومانەوەو دەموت دەبێ حکوومەت مەبەستێکی لەو وتوویژە هەبێ کە لە بەرژەوەندی خۆی و دژ بە ئێمە بێت.

ئەو شەوە، باس هەر باسی وتوویژ بوو، مامۆستا عەزیزیش بەوپێیە وازی لە شیکردنەوەی چینایەتی هێنابوو، هەروەک باسی رۆڵی گرنگی

سەرۆک هۆزی دەکرد کە لە وڵاتی نیمچە دەرەبەگی و نیمچە بورژوازیدا دەتوانێت بیگێڕێت. نازانم ئەوانەی هەر بۆ موجامەلەی سەید شەریف دەوت یان بڕوای پێبوو.

من زیاتر قسەکانی بە موجامەلەی سەید تێدەگەیشتم، چونکە هەر شەوی پێشوو، وەک کادرێکی وڵاتی چین بۆ مام سەید دەئاخڤی.

کە ڕۆژمان لێ بووەوە، هەر زوو وەدەر کەوتین، زیاتر مەبەستمان بیستنی هەواڵی نوێ بوو.

هەرواش بوو، دەنگ بە زوویی لە ناو پێشمەرگەدا بڵاو بووەوە، کە هەر ئەمڕۆ ، شاندی خۆمان لە ڕێی لۆلانەوە بە میانگیری حاجی موحەممەد بە هالیکۆپتەر بەرەو بەغدا دەچن.

لەناو دێ دکتۆر چالاکمان بینییەوە، هەر خێرا دوا هەواڵی پێگەیاندین و کەوتە شرۆڤەی بارودۆخەکەو دەیوت هەرچەند ڕۆژێکی دی نابات، هەموومان دەگەڕێینەوە بۆ شارەکانی خۆمان.

پێشمەرگەکان، دەستە دەستە، پێکەوە کۆدەبوونەوەو باس هەر باسی وتووێژ بوو، بەڵام من هەرچەند سەیرم دەکرد، تەرازووی هێز بە هیچ جۆرێ لە بەرژەوەندی ئێمە نەبوو. ئەی حکوومەت بۆچی بەو وتووێژە ڕازی بوو ، ئەوە پرسیارێک بوو لە مێشکمدا گێنگڵی دەدا و بێ وەڵام دەمایەوە .



٤٨

گەڕانەوەی شاندەکە بە دەست بەتاڵی ، بۆ من و زۆربەمان ، مایەی سەرسوڕمان نەبوو. ئێمە هێشتا نەبوو بووین بە هێزێک کە حسابی جدیمان بۆ بکرێ. تەرازووی هێز هێندەی بەلای حکوومەتی بەغدادا دەشکا کە بە هیچ جۆرێک مۆڵەتی بەراوردی نەدەدا. هەموو هێزی پێشمەرگە بە قەدەر فەوجێکی رژێمی عێراقی نەدەبوو، ئەوە چەک هەر لێگەڕێ. ئەی کە وابێ مەبەستی حکوومەت لە وتوووێژ چی بوو. من وای بۆ دەچم هەر داوای گەڕانەوە بووبێت بۆ بەر سێبەری رژێم، چونکە ئەوان لەوپەڕی هێزو ئێمەش_ بیروباوەڕی لێ لابدەیت_ لەوپەڕی لاوازیدا بووین.

دەنگۆی سەرنەکەوتنی وتوووێژی ئێمەو حکوومەت، هەر زوو لەناو دۆڵەکەدا بڵاو بووەوە، بۆیە هەموو بە پەلە کەوتینە خۆمان، بە تایبەتی کاتێک زانرا کە حکوومەت داوای چۆڵکردنی ئەو ناوچانەی کە سەرکردایەتی لێبوو کردبوو. هەر بۆیەش پاش نیوەڕۆ، فەرمان درا کە هەموو بەرەو سنووری تورکیا بڕۆین و بچینە نێو خاکی تورکیا، لەگەڵ ئەوەشدا ورەی پێشمەرگەکان بە گشتی هەر بەرز بوو. تێزەکانی (ماو) سەبارەت بە شۆڕش، بڕوای بە شۆڕشی درێژخایەن بوو، بۆیە

کەس نارەزایی نیشان نەدا، ئەگەرچی خۆشحاڵیش نەبووین.

هەموو ملی شاخەکەی سەرووی خۆمان، کە سەراپا بەفر دایپۆشیبوو گرتە بەر. وەک دەرکەوت حکوومەت مۆڵەتی بیست و چوار کاتژمێری بە شاندەکە دابوو، بۆیە دەبوو پێش تەواو بوونی ئەو کاتە، ئەو ناوچانە بە جێ بهێڵین.

لەراستیدا ئێمە خاوەنی ئەو هێزە نەبووین، کە بتوانین بەرگری لە بنکەیەکی سابیت بکەین، بۆیە هەر دەبوو، ئەو ناوچەیەی کە ئاشکرا بووبوو وەکو سەرکردایەتی بە زووترین کات چۆڵ بکرێ و بەوپێیەش ئێمە بکەوینە جەولەو گەڕان، بەڵام تا ئەو بڕیارە جێبەجێ دەکرا، دەبوو بۆ خۆ رێکخستنەوە بچینە نێو خاکی تورکیا و لەوێ چاوەڕوانی گەیشتنی چەکەکان بین.

سەرکەوتن بەو سەرەتای زستانەو بە شاخێکی وا بڵنددا، یەکجار کارێکی سەخت دەهاتە پێش چاو، لەگەڵ ئەوەشدا، هەموو بە هێزێکی نوێوەو بە بڕوایەکی تیۆرییەوە، بە شاخەکەدا هەڵدەزناین.

مامۆستا عەزیز، بەدەم هەڵگەڕان بە شاخەکەدا، باسی شۆڕشی درێژخایەنی بۆ دەکردین کە نازانرێ چەند دەخایەنێت و دەبێ مەیدانی بەرەنگاری بەرفراوان بکرێت و سەرتاسەری کوردستان بگرێتەوەو لە هەموو شوێنێک گورزی کوشندە لە دوژمن بدرێ تا ئەو کاتەی شۆڕش لە شاخەکانەوە، بەرەو شارەکان دەڕواو رزگار دەکرێ. هەموو گوێقوڵاخی شیکردنەوەکەی بووین، کە شێخ سدیق، نازانم چۆن وا باش گوێی لە قسەکانی عەزیز بوو، وتی:

_ دە کە وابێت ئەوە فریای من ناکەوێت و بڕوا ناکەم جارێکی تر جادەی قیر ببینمەوە.

شێخ مەبەستی تەمەن بوو، ئەو لە سەروو شەست ساڵییەوە دەبوو، بەوپێیەش کە عەزیز باسی دەکرد، ئەو جۆرە شۆڕشە دەیان ساڵی دیکەی دەخایاند و بە پێی تەمەنیش، ئیدی ئەوە فریای شێخ سدیق نەدەکەوت و وەک خۆی دەیوت، ئەو، تەمەن مەودای نەدەدا، ئەو سەرکەوتنە ببینێت.

ئێمە کە هەموو مێشکمان تژی بوو لە تیۆری شۆڕشگێڕی، ئەوەمان بە جۆرێک لە لاوازی بیرکردنەوە، بۆ یاشێخ، لە قەڵەم دەدا.

راستە ئێمە وەک تیۆری بڕوامان بە شۆڕشی درێژخایەن بوو، بەڵام وڵاتی ئێمە و چین، بە هیچ شێوەیەک بەراورد نەدەکرا، لەگەڵ ئەوەشدا، وەک حاجی مەحموود دەیوت تازە هەموو تووشبووین و دەبوو لە سەر شۆڕش بەردەوام بین.

من لای خۆمەوە تەقدیری شێخ سدیقم دەکرد کە بەو تەمەنەیەوەو بەو خوێندەوارە سەرەتاییەوە هاتبووە نێو شۆڕشی نوێ و بەشداری دەکرد. ئەوە خۆی لەخۆیدا ئەوپەڕی بڕوابوون بوو، بە توانای گەلەکەی و نموونەیەکیش بوو بۆ لاوانی وڵات کە مرۆڤێک لەو تەمەنە باڵایەدا بتوانێ وەک گەنجێک بەشداری لە خەبات و بەرەنگاریدا بکات. کە سەرکەوتینە سەر شاخەکە، لەوێوە دەمڕوانییە دەورووبەر، تا چاو بڕ کات هەر شاخی تر بوو، کە بەفر داپۆشیبوو، بەڵام ئەوەی ئێمە لە هەمووی بەرزتر بوو، چونکە هەموو شاخەکانی تر لە خوارمانەوە لە گردۆڵکە دەچوون و سپی دەچوونەوە.

لە داگەڕاندا، کە خەریک بوو، وردە وردە دەورووبەر تاریک دەبوو ، پێیان راگەیاندین کە ئێستا لە نێو خاکی تورکیاین، کە لە راستیدا پارچەیەکی تری کوردستان بوو.

ئەو شەوە لە نزیک دێیەک بە ناوی (گەلیشم) بنەو بارەگامان هەڵدا. باش بوو زۆربەی پێشمەرگەکان چادرو بەتانییان پێبوو. ئێمەش لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکی تردا ، لە ژێر چادرێکدا، تا رۆژ بووەوە، هەڵماندا.

ئەگەرچی دەوروبەر یەکجار سارد بوو، لەگەڵ ئەوەشدا، ئێمە هەستمان بە سەرما نەکرد وەک ئەوەی لە شاخی قەندیل بە سەرمان هات. ئەم پێشمەرگانە لە ئێمە شارەزاتر بوون، لەو بوارەدا، چونکە زۆر بە زوویی و بە سەرکەوتوویی چادرەکەیان بۆ هەڵدرا کە ئەوە هەر بۆ ئێمە لە قەندیل نەڕەخسا. خراپی چادرەکەمان بوو، یان نوقسانی یان نەشارەزاییمان ، ئێمە ئەو کارەمان لە قەندیل بۆ جێبەجێ نەکرا.

کە رۆژ بووەوە سەرنجی دەورووپشتمان دا، ئەوەی لامان سەیر بوو ئەوە بوو کە هیچ سەربازگەیەکی تورکی یان مەخفەری پۆلیس کە لێرە پێیان دەوت (قەرەقۆڵ) نەدەبینرا، ئەوەش بۆ ئێمە مایەی خۆشحاڵی بوو کە دەمانتوانی تا چەکەکان لە سووریاوە دەگات لەو ناوچانە، بێ ترس، بحەوێینەوە.

کاتێک خەڵکی گوندەکانی ئەو ناوچەیە، هەستیان بە بوونمان کرد لە خاکیاندا، زۆر یارمەتیان داین و نان و خۆراکێکی زۆریان بۆ دەهێناین، کە نموونەی هەستی یەک نەتەوەیی بوو. ئەوان بە بینینی ئێمە، بە چەکەوە و بە جلی پێشمەرگایەتییەوە، سەربەرز بوون، چونکە لەو وڵاتەی ئەوان، تا ئەو کاتە دانیان بە کوردبوونی خەڵکەکەو ناوچەکەدا نەدەنا، بۆیە بینینی ئێمە لای ئەوان بەرجەستە بوونی کوردو کوردستان بوو.

بینینی هەستی ئەوان بۆ ئێمە مایەی سەربڵندی بوو، لەراستیدا بە هەموو شێوەیەک دەیانویست هەستی کوردانە و جوامێریان دەربڕن.

شێخ سدیق کە زۆر بە وردی سەرنجی ڕەفتاری خەڵکی ئەو ناوچانەی دەداو ئەو هەستە کوردانەیەی ڕۆژانە بە چاوی خۆی دەدی. وتی:

_ بڕوام وایە ، بە چاوی خۆم سەرکەوتن دەبینم.

مەبەستی، هەستی کوردانەی، کوردەکانی تورکیا بوو، لەڕاستیدا نموونەیی بوو، هەستمان نەدەکرد لە وڵاتێکی تردایین.

وەک دەرکەوت بۆمان، مەسەلەی گەیشتنی چەک لە سووریاوە کارێکی هێندە ئاسان نەبوو، وەک پێشبینی دەکرا، چونکە دەبوو بە قاچاخ چەکەکان بگاتە نێو خاکی تورکیا و لە سنووری (قامیشلی) یەوە بۆ شاری (نەسیبین) دەرباز بکرێ و ئینجا شارەوشار بگوازرێتەوە تا دەگاتە شارۆچکەی (شەمدینان) و ئینجا بە دەست ئێمە بگات، بۆیە ئاگادار کراین کە ڕەنگە ئەو کارە چەندین هەفتە، بخایەنێت، هەر بۆیەش دوای وتووێژ لەگەڵ گەورە پیاوانی ناوچەکەدا بڕیار درا کە هەرچەند پێشمەرگەیەک بە سەر ماڵێکدا دابەش بکرێن تا چەکەکان دەگات، چونکە لەڕاستیدا نەدەتوانرا لەو کوێستانە ژیان لە ژێر چادردا بە سەر ببرێ، بۆیە ئەو کارەی خەڵکانی ئەو گوندانە دەرهەق پێشمەرگە کردیان بە کارێکی مەزن و بێ وێنە لە لامان لە قەڵەم درا.

حاجی مەحموود کە لە شۆڕشی پێشوودا بەشداری کردبوو، زۆر بە دڵنیاییەوە دەیوت:

_ ئێمە خاوەنی ئەم گەلە بین هەر سەردەکەوین.

ئەو هەستە کوردانەیەی لەو ناوچانە دیمان ، مۆڵەتی بە تیورییە شۆڕشگێڕییەکانی مامۆستا عەزیز لەق کردبوو ، بۆیە پێم وت:

_ وابزانم ماو باسی ئەم هەستەی، لە کتێبەکانیدا، نەکردووە.

مامۆستا عەزیز سەیرێکی قووڵی کردم ، دیار بوو لە مەبەستەکەم دەگەیشت، چونکە وتی:

_ خۆ ماو کتێبی بۆ ئێمە نەنووسیوە.

من هەر دەمویست بیجووڵێنم ، بۆیە بۆ دڵنەوایی وتم:

_ بەڵام دەتوانین سوودی لێوەرگرین

بزەیەک گرتی، هیچی نەوت.

❊ ❊ ❊

## ٤٩

پێشمەرگەکان بە سەر ماڵی گوندەکانی ئەو ناوچەیەدا، دابەشکران. ئێمە بەر ماڵی کەسایەتییەکی ناسراوو دەستڕۆیشتوو کەوتین لە دێی (گەڵیشم).

خاوەن ماڵ وەک کوێخا موزەفەر خۆی ناساند، تا بڵێی مرۆڤێکی میواندۆست و رووخۆش و دەست و دڵ فراوان بوو. بە هیچ جۆرێ رووگرژی نیشان نەدەدا ، ئەگەرچی ئێمە پێنج پێشمەرگە بەر ماڵی ئەو کەوتبووین.

هەموو چاوەڕێی گەیشتنی چەکەکان بووین، بەڵام لە باتی گەیشتنی، هەواڵی ناخۆشمان پێدەگەیشت کە دەیوت، لەو سنوورانەی نزیک سوریا، شەڕو پێکدادان لە نێوان گرووپە کوردییەکانی نێو عێراق روودەدات کە بۆ ئێمە هەواڵێکی زۆر ئازار بەخش بوو.

ئێمەی کورد ئەزموونێکی دووردرێژی شەڕی ناوخۆمان هەبوو کە مایەی شانازیمان نەبوو. لە ناوەڕاستی شەستەکانی سەدەی پێشوودا، لێکترازانێک لە بزووتنەوەی کوردایەتی رووی داو هێزەکانی کورد و پێشمەرگەی کرد بە دوو کەرتەوە. ئەگەرچی لەراستیدا هیچ پاساوێکی

لۆژیکی، بۆ ئەو لەت بوونە، نەبوو، گەر مرۆڤ چاو لە بەرژەوەندی تەسکی حزبی و سوودی شەخسی بپۆشێ. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بزووتنەوە گەورەیەی کە مایەی ئومێدی هەموو گەلەکەمان بوو، کەوتە بەر رەشەبای دووبەرەکییەک کە چەندین ساڵی خایاند و جگە لە ماڵوێرانی و یەکتر کوشتن، هیچ سوودێکی تری نەبوو.

ئەگەرچی دەیان پاساو، بۆ ئەو بارودۆخە، دەدۆزرایەوە گوایە لایەنێک چەپەو ئەوی دی راستڕەو، بەڵام لەراستیدا ئەوە نەبوو، چونکە لایەنی خۆ بە چەپزان پەنای بردە بەر حکوومەتی عێراقی و کەوتە دژایەتی لایەنەکەی تر ، بە هاوکاری چەک و جبەخانەی حکوومەت. جا سەیر ئەوە بوو ئەو تاقمە دەیویست لە گۆشەیەکی ئەم وڵاتەداو بە رەزامەندی حکوومەتێکی عەسکەری و فاشی بەهەشتێکی سوسیالیستی چین ئاسا لە گوندێکی نزیک سلێمانی بنیات بنێ کە زیاتر لە خەیاڵ و خەو دەچوو، وەک راستی. چۆن دەتوانرێ لە ژێر سێبەری دیکتاتۆرییەت و حوکمی عەسکەری داو لە وڵاتێکدا کە هیچ ژێرخانێکی ئامادەکراوی بۆ سوسیالیزم نەبوو ، سوسیالیست ئەویش بە رەزامەندی رژێمێکی فاشی بسازێنرێ. ئەمە لە خەیاڵ زیاتر نەبوو کە بووە مایەی شەڕێکی دووروودرێژ و سوودمەندیش تەنها حکوومەتی عێراقی بوو.

ئەمانەم لەگەڵ مامۆستا عەزیزدا موناقەشە دەکرد. ئەگەرچی ئەو خۆی دەروێشێکی رێبازی (ماو) بوو، لەگەڵ ئەوەشدا، ئەویش نیگەرانیی خۆی نەشاردەوەو نارەزایی لە شەڕی کوردو کورد بە ئاشکرا دەربڕی.

وتووێژی رۆژانەمان بریتی بوو لە هەڵسەنگاندنی ئەو هەواڵانە. هەریەکەو رای خۆی دەدا، ئەوانەش کەم نەبوون کە تا ئەو کاتە مێشکیان پاک نەبووبووەو شەڕی ناوخۆشیان نەک بە ئاسایی بەڵکو وەکو شەڕی چینایەتی دەنەخشاند. کوێخا موزەفەری خانەخوێمان زۆر بە وردی

گوێی لە موناقەشەکانمان دەگرت. مرۆڤێکی دونیادیدە بوو، ئەویش تەمەنی لە شەست ساڵ تێپەڕی کردبوو.

زۆر باسی مێژووی خەباتی کوردەکانی تورکیای بۆ دەکردین، زانیارییەکی باشی لە سەر شۆڕشەکانی شێخ سەعیدی پیران و سەید رەزاو ئیحسان نوری پاشا پێدابین، ئەمە جگە لە مێژووی بەردخانییەکان و ململانێی نێوانیان کە وەک هۆی سەرەکی دارمانی بەردخانییەکانی نیشاندەدا. زۆر باسی شۆڕشەکەی شێخ عوبەیدڵڵای نەهری و خەباتی بێ وچان و لەوەودواش تێکشکانی، بۆ دەکردین و لە ئەنجامگیری هەمووشیاندا هەر هۆی تێکڕمانی ئەو شۆڕشانەی بۆ هۆکاری ناوخۆ و نەسازان لەگەڵ یەکدی دەگێڕایەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا، ئێمە هەر هیواخوازی ئەوە بووین کە ئەو هەواڵانە ناڕاست بن و دوژمنانی ئێمە بڵاوی بکەنەوە. من هەمیشە تەئکیدم لە سەر ئەوە دەکرد کە تۆ بڵێی میللەتێک کە بەو هەموو ئەزموونەدا تێپەڕیبێت، هێشتا پەند و دەرسی وەرنەگرتبێ؟ میللەتانی دنیا، بە هەڵەدا دەڕۆن، بەڵام دووپاتی ناکەنەوە. تۆ بڵێی ئەم گەلەی ئێمە جیاواز بێت. هیوام دەخواست وا نەبێت.

هەندێ رۆژ، دەنگوباسی چەک دەهات و گوایە سنووری سوریای بڕیوەو گەیشتۆتە نێو خاکی تورکیا، بەڵام ئیدی دەنگ نەدەما. ئەوەی راستی بێت ، هیچ ئامێرێکی پەیوەندی نە تەل و نە بێ تەل لە بەردەستدا نەبوو تا لە راست و دروستی هەواڵەکان دڵنیا بین. هیچ گوندێک لەو ناوچەی شەمدینانە کە ئێمەی لێ بووین، نە کارەباو نە تەلەفۆن و نە هیچ بابەتێکی پەیوەندی لێ بوو، بۆیە دەبوو چاوەڕێی هەواڵی داهاتوو بین کە ئەویش نەدەزانرا راستە یان نا.

رۆژەکانمان بە گەڕان بە ناو دێکانی ئەو ناوچانەدا بۆ شارەزابوون

بە سەردەبرد. ناوچەکە هەمووی شاخی بڵند و لێڕەوارو دۆڵی قووڵ بوون، هەر دەتگوت خوا بۆ شەڕی پارتیزانی خوڵقاندوویەتی.

نزیکترین قەزا لێمانەوە (شەمدینان) بوو کە وەک دەوترا گەورەترین شارۆچکەی ئەو ناوچەیە بوو. ئێمە کەسمان نەماندەتوانی بچینە ناوی، چونکە دەورووبەری بە سوپای تورک تەنرابوو. ئەو هەواڵانەی کە دەربارەی دەمانزانی تەنها ئەوانە بوون کە لە زاری گوندییەکانی ئەو ناوچەیەوە پێمان دەگەیشت.

ئەوەی لام سەیر بوو، لەو دێیانەدا هیچ سیمایەکی سەربازی پێوە دیار نەبوو، نە سەربازخانە و نە قەرەقۆڵ، کە ئەوان بە مەخفەری پۆلیسیان دەوت و نە هیچ. لەوە دەچوو حکوومەتی تورکیا ئەو ناوچانەی بە یەکجاری پشتگوێ خستبێت، چونکە نە قوتابخانەیەک بەدی دەکرا و نە خەستەخانەیەک. ناوچەکە هەمووی بە دەست نەخوێندەوارییەوە دەیناڵاند و کەسمان نەدی بتوانێ نامەیەک بە کوردی بنووسێ. ئەگەرچی هەموو ئەوەشمان دەزانی کە حکوومەتی تورکیا زمانی کوردی قەدەغە کردبوو، لەگەڵ ئەوەشدا قوتابخانەیەکیشمان بە زمانی تورکی بەدی نەکرد. دیاربوو حکوومەت دەیویست ئەو خەڵکە نقومی جەهل و نەخوێندەواری بێت.

ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە هیچ رێگەوبانێکی قیرتاوکراومان لەو ناوچانە بەدی نەکرد و خەڵکەکەی هەر بە پێ، یان بە سواری ئاژەڵ، هاتووچۆی دەکرد. ناوچەکە بە گشتی لە تابلۆیەکی رەنگینی سروشت کرد دەچوو کە دەستی مرۆڤی بەر نەکەوتبوو. لەراستیدا دیمەنی ئەو شاخە بەرزانە کە بەفر دایپۆشیبوون دڵی مرۆڤی دەهەژاند و خەیاڵ دەیبردەوە و بیری بۆ ئەوە دەچوو کە کەی رۆژێ دادێ دەستی ئاوەدانی بەو ناوچەیە بگات کە بێ شک دەبوو بە بەهەشتێک بۆ خۆی.

ژیانی رۆژانەمان لە ماڵی کوێخا موزەفەر تا بڵێی خۆش بوو، ئەوەی سەرنجی هەمووومانی ڕاکێشابوو، ئەوە بوو هەموو بەیانییەک ماستی تازەی بۆ دەهێنایین کە لەو ناوەڕاستی زستانەدا، بە دەگمەن چنگ دەکەوت، لای ئێمە مایەی سەرسوڕمان بوو.

لە پرسیاری ئەوەی چۆن ماست پەیدا دەبێ لەو ناوە کوێخا وتی:

_ ئەوە ماستی بەهارە و ئێمە لە تەنەکەدا دایدەنێین و پاشان ڕۆنی قرچاوی بەسەردا دەکەین. ئیدی بەو هۆیەوە تا بەهار بڕ دەکات و بێ ماست نابین.

لەوەڵامی ئەو ڕوونکردنەوەیەدا شێخ سدیق وتی:

_ گەر چەکیش نەگات و هیچمان دەستنەکەوێت ، من ئەم زانیارییە بە دەستکەوتێکی گەورە بۆ خۆم و ناوچەکەمان دەگوازمەوە و جێ بە جێی دەکەم.

مامۆستا عەزیز لە ژێر لێوەوە وتی:

_ ئەوە مانای وایە ئیتر تاقەتی شۆڕشی نەماوە.

هیواخواز بووین شێخ سدیق گوێی لەو توانجە نەبووبێت.

*** 

## ٥٠

بەیانییەک کە تازە لە خەو هەستابووین، لە دەرگای ماڵی کوێخا موزەفەر درا، پێشمەرگەیەکی خۆمان بوو، هەواڵی گەیشتنی چەکەکانی پێڕاگەیاندین. ئەو زۆر بە خۆشحاڵییەوە دەیوت کە شەو چەکەکانمان، بە لۆرییەکی بارهەڵگر، گەیەنراوەتە دێیەکی نزیک شەمدینان.

هەواڵەکە بۆ ئێمەش دڵخۆشکەر بوو، چونکە لەراستیدا زۆر لە ماڵی کوێخا مابووینەوەو لە میوانێکی ئێسک قورس دەچووین، هەرچەندە بە هیچ شێوەیەک ئەوەمان لە رووی مام کوێخادا بەدی نەکرد، بەڵام هەر مانەوە، ئاوا بۆ ماوەیەکی درێژ لە تاقە ماڵێکدا زەحمەتێکی زۆرە بۆ خاوەن ماڵ و منداڵی بەڵام چاریش نەبوو.

ئەوە نەریتێک بوو کە پێشمەرگە، بە ناچاری، پەیڕەوی دەکرد، بە تایبەت لەو شوێنانەدا کە بارەگای لێ نەبوو.

بە هەرحاڵ، ئێمەش، بەزوویی لە ماڵ دەرپەڕین و لە نێو دێ گرد بووینەوە. بڕیار ئەوە بوو کە چەند وڵاخمان پێ پەیدا دەکرێ، بە کرێ بێ یان بە خواهێشت لەگەڵ خۆمان بەرین بۆ گواستنەوەی چەکەکان بۆ لای خۆمان.

بۆ ئەمەش حاجی مەحموودو شێخ سدیق دەستڕەنگینی و توانای خۆیان نواند و وڵاخیان زۆر بە زوویی لەناو دێ، بۆ خۆیان و ئێمە، پەیدا کرد.

لەگەڵ مامۆستا عەزیزدا، کە هەردووکمان شارەزای بارکردنی وڵاخ نەبووین، هەندێ زانیاری سەر پێییمان لە شێخ سدیق دەربارەی جۆری بارکردن و شەتەک دانی وڵاخ وەرگرت کە لەمەودوا تا رادەیەک سوودبەخش بوو. هەموو پێشمەرگەکان دەستەدەستە بەرەو گوندی (ماسیرۆ) ملمان نا کە تا ئەو شوێنە لۆرییەکە توانیبووی بڕ بکات، چونکە ئیدی ئیتر لەوێیەوە هیچ ڕێگەوبانێک، نەبوو، نە لۆری، یان هیچ ئۆتۆمۆبیلێک نەیدەتوانی لەبەر نەبوونی جادە ڕەوت بکات.

چەکەکان، لە ژێر باری فەردە ئاردا، لە نێو لۆرییەکەدا شاردرابوونەوە کە بریتی بوون لە کلاشینکۆف و ئار. پی. چی و یەک دوو ڕەشاش و هەندێ مین و دوو دۆشکەو فیشەکێکی زۆر، لەگەڵ چەند دانەیەک لە هۆکی تۆکی کە زۆر قورس و قەبە دەهاتنە پێش چاو. بۆ ئێمە ئەوە دەستکەوتێکی گەورە بوو. حکوومەتی عێراقی دوای شکستی حەفتاوپێنج هەموو هەوڵی ئەوە بوو کە چەک لە کوردستان نەهێڵێ و مۆڵەت نەدات کورد دەستی بگاتەوە چەک، بۆیە ئەم وەجبە چەکە هیوا بەخش بوو کە لە ڕێگەیەوە دەمانتوانی بە شانازییەوە بۆ ناوچەکانی خۆمان بگەڕێینەوە.

بە یارمەتی حاجی و شێخ سدیق چەکەکانیان بۆ بار کردین و ئێمەش کەوتینە دوای وڵاخەکان. هەورازو نشێوی ڕێگا، زوو زوو، بارەکەی لار دەکردەوەو ناچار دەبووین شەتەک و گرێی بدەینەوە کە بۆ ئێمە هەر نەشارەزایی دەنواند.

بارەکان، بە تایبەتی ئەوەی من و مامۆستا عەزیز، هەمیشە بە لایەکدا لار دەبوونەوە کە دەبوو خێرا فریای ڕاستکردنەوەی بکەوین.

ناشارەزاییمان لە بەستن و گرێدانی گوریس بێ وێنە بوو. سەیرمان لە وڵاخەکانی ئەوانیتر، بە تایبەتی حاجی و شێخ سدیق دەهات کە زۆر بە باشی و بێ گرفت رەوتیان دەکرد. هەر چۆنێک بوو وڵاخەکانمان گەیاندە دێی گەلیشم و لەوێ بارەکان داگیران و بڕیاری دابەشکردنی خرایە رۆژی داهاتوو.

ئەو شەوە لە ماڵی کوێخا موزەفەر کە دوا شەومان بوو، ماینەوە. باس هەر باسی چەکەکان بوو. لە راستیدا هەموو بەو وەجبە چەکە، گەلێک سەربڵند بووین کە دەمانتوانی بە شانازییەوە بگەڕێینەوە بۆ ناوچەکانمان و چەک بە سەر پێشمەرگە بێ چەکەکاندا دابەش بکەین.

ئەوەی راستی بێت چەکەکان، بە گشتی، هەمووی چەکی سووک بوون و هیچی وای تێدا نەبوو کە کاریگەرییەکی زۆری هەبێ و باڵانسی هێز لە نێوان ئێمەو رژێمدا بگۆڕێ، گەر مرۆڤ چاو لە ئار. پی . چییەکان بپۆشێ کە دەتوانرا دژی تانک بە کار بهێنرێت.

بەو چەکانە تەرازووی هێز ئەوندە بەلای ئێمەدا نەدەشکا کە گۆڕانێکی دراماتیکی روو بدات، لەگەڵ ئەوەشدا بۆ ئەو سەرەتایە هەر باش بوو، چونکە تا ئەو کاتە لە تفەنگی سمێرنۆف و کلاشینکۆف و هەندێ بڕنەوی کۆنە زیاتر لای پێشمەرگە نەبوو.

بوونی ئەو جۆرە چەکە سووکانە دڵنیای کردین کە شۆڕشەکەمان درێژخایەن دەبێ.

ئەمەم لە لاوە بە شێخ سدیق وت کە بە دەنگی بەرز وتی:

__ توخوا؟

ئیدی جڵەوم دایە دەست مامۆستا عەزیز کە باسی شۆڕشی درێژخایەن بکات ، کە چۆن کاتێک تەرازووی هێز بەلای دوژمندا دەبێ ، ئیدی

بە ناچاری دەبێ پەنا ببەیتە بەر ئەو جۆرە خەباتە. نازانم شێخ تا چەند بڕوای بەو تیۆریانە دەکرد ، بەڵام زۆر باش گوێی شل کردبوو و هیچ قسەی نەدەکرد. کە ماموستا عەزیز لە خوتبەکە ببووەوەو سەرکەتوانە وتی:

ــ ئێستا تێگەیشتیت یا شێخ؟

شێخ دەستێکی بە سەرو سمێڵە سپییەکەیدا هێناو وتی:

ــ گرنگ نییە. خوامان لە پشتە.

ماموستا عەزیز وەک ئاسنی ساردی کوتابێت تەنها سەری بۆ لەقاند . ئەو شەوە هەر باسی دەنگۆی شەڕی ناوخۆش دەکرا، کە لە راستیدا هەموومانی نیگەران کردبوو. خانە خوێکەمان زۆر باسی مەترسی شەڕی ناوخۆی بۆ کردین و هەمیشە هەر ئەوەی دووپاتکردەوە کە هیوادارە ئەو هەواڵانە راست نەبن و هەوڵی ناحەزان بن. ئەو دەیوت قەت نەکەن رووی تفەنگ بکەنە یەکدی، نەکەن.

درەنگانی شەو هەواڵمان بۆ هات کە دەبێ بەیانی زوو لە خەو هەستین و بەشە خۆراکێک لەگەڵ خۆمان، وەک تێشووی رێگا، هەڵبگرین، چونکە بەرەو ناوچەی خۆمان دەچین.

سەرەتای مانگی دوانزە بوو، ئیدی سەرما و بەفر بە تەواوی دەستی پێکردبوو، نەدەبوو لەوە زیاتر لەو کوێستانانە بمێنینەوە، بۆیە بڕیارەکەمان زۆر لا پەسەند بوو، لە راستیدا مام کوێخا بەو پەڕی دڵفراوانییەوە پێخۆری چەند رۆژێکی بۆ ئامادە کردین کە نموونەی میواندۆستی و میهرەبانی بوو.

وەک پێشنیار، بە گرووپەکەی خۆمانم وت کە پێم باشە لەم گەڕانەوەشدا هەر پێکەوە بین. لەراستیدا ئیدی تا رادەیەک شارەزا

بووبووین و لەگەڵ یەکدی راهاتبووین، بۆیە هەمووش پێشنیارەکەی منیان قبووڵ کرد.

بەیانی پێش هەموومان شێخ سدیق و حاجی مەحموود هەستابوون و خۆیان بەستبوو.

کە چووینە دەرەوە پێشمەرگەکان هەموو ئامادە بوون، یەکە یەکەماڵئاواییان لە سەرکردایەتی کرد.

ئێمە وڵاخەکانی خۆمان شەتەک دایەوەو لەگەڵ قافڵەکەدا بەرەو سنووری خۆمان بەڕێکەوتین .

کە سەرکەوتین وتەکانی کوێخا موزەفەر لە گوێمدا دەزرنگایەوە:

_ بە دەنگی، تا رادەیەک بەرز لەبەر خۆمەوە وتم:

'نەکەن ئەم چەکانە دژی یەکدی بەکاربهێنن..'.

شێخ سدیق لە پێشمەوە دەڕۆیشت، ئاوڕی لێدامەوەو وتی:

'ها؟'.



سەلام عەبدوللا

_ لە ١٩٤٨ لە شاری سلیمانی لە دایک بووە.

_ خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و خانەی مامۆستایان و دواناوەندی لە سلیمانی تەواو کردووە.

_ لە ١٩٦٨ بووە بە مامۆستا.

_ لە ١٩٧٤ پەیوەندی کردووە بە شۆڕشی ئەیلوولەوەو پاشان چوتە ئەڵمانیا بۆ خوێندن.

_ لەساڵی ١٩٧٧ لە لایەن ئیستیخباراتی سلیمانی گیراوەو پاشان براوە بۆ زیندانی هەیئە خاصە لە کەرکووک.

_ لە گەڵ دوانزە هاوەڵیدا هەر ئەو ساڵە لە زیندان رایان کردووە، پاشان بووە بە پێشمەرگە.

_ لە ١٩٧٩ چووەتە سوێد و لە زانکۆی ئۆپسالا بەشی ئێرانناسی تەواو کردووە.

_ لە ١٩٩٢ گەڕاوەتەوە کوردستان.

_ لە ١٩٩٢ بووە بە یاریدەدەری پارێزگاری سلیمانی.

_ لە ١٩٩٦ بووە بە بریکاری وەزیری رۆشنبیری ئیدارەی هەولێر.

_ لە ٢٠٠٠ بووە بە پارێزگاری سلیمانی لە سەر ئیدارەی هەولێر.

_ لە ٢٠٠٦ بووە بە بەرپرسی لقی ٤ی پارتی دیموکراتی کوردستان.

_ ئیستا سەرنووسەری رۆژنامەی (خەبات) زمانحاڵی پارتی دیموکراتی کوردستانە.

_ جگە لە زمانی کوردی، بە زمانەکانی عەرەبی، فارسی، سویدی و ئینگلیزی شارەزایە.



نرخ (٤٠٠٠) دینار

1 000000 000037

خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
MUKIRYANI HOUSE FOR PRINTING & PUBLISHING
www.mukiryani.com
2015